گەشتێک

# بە نێو رێزمانی کاردا



پرۆفیسۆر

د. شێرکۆ بابان

کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین /هەولێر

هەولێر ٢٠١٦

# گەشتێك بە نێو رێزمانی کاردا

پرۆفیسۆر

د. شێرکۆ بابان

کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین

هەولێر ٢٠١٦

ناوی کتێب: **گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاردا**

ناوی نووسەر: پ. د. شـێرکۆ بـابـان

بابەت: ڕێزمانی کوردی

تیراژ: ( ٣٠٠) دانە

دیزاین: دەزگای گۆڤار بۆ چاپ بڵاوکردنەوە (ماهر موعین مستەفا)

چاپی یەکەم / ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٣٧) ساڵی ٢٠١٥ ی

پێدراوە.

# ناوەڕۆك

## بابەتی پێنجەم

### پانوڕامایەك بۆ واتاكانی كاری (دان)



## بابەتی شەشەم

### سێتی ڕێزمانی وەك كەرەستەیەك بۆ فێركردن لە وانەی ڕێزماندا



## بابەتی هەفتەم

### كاری ئاراستەدار و كاری ئامرازدار لە ڕێزمانی كوردیدا

# کرۆنۆلۆژیای بڵاوکردنەوەی بابەتەکان

## پێداچوونەوە (٢٠١٥)

١- هەندێك لە سیما رێزمانیەکانی (کار)

٢- کاری (کردن) یان دیوە تێپەڕەکەی کاری بوونی رووداودار

گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٩٣)، هەولێر ٢٠٠٥

٣- رێزمانی کاری (کردن) بۆ مۆستایانی زمانی کوردی

گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٥٨)، هەولێر ٢٠٠٥

٤- گەشتێك بەنێو رێزمانی کاری (دان)دا

گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٦

٥- پانۆرامایەك بۆ واتاکانی کاری (دان)

گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٥)، هەولێر ٢٠٠٩

٦- سێتی رێزمانی وەك کەرەستەیەك بۆ فێرکردن لە وانەی رێزماندا

گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی)، ژمارە (٦٧)، هەولێر ٢٠٠٦

٧- کاری ئاراستەدار و کاری ئامرازدار لە رێزمانی کوردیدا.

گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٥٧)، هەولێر ٢٠٠٨

٨- کارەکانی دەنگی سروشتی لە ئاخاوتنی کوردیدا

گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٢)، هەولێر ٢٠٠٨

## گوتەیەك:...

کاتێك کە لە ڕێزمانی کوردیدا ئیش دەکەین خۆشیەکی زۆر گەورە دەمان گرێت، هەر دەڵێیت منداڵین و بە پەنجەی دۆشاومژە هەنگوینی شەمەتلێنە دەخۆین. بە ڕاستی، ئەم سی و نۆ ساڵە (١٩٧٧-٢٠١٦)، بە ئەشقێکی زۆر گەورەوە، شانمان داوەتە بەر ئەم خزمەتە زانستیە، کە ناوازیە و کە جودایە لە هی کەسانی تر، چی لە ڕێزمانی کوردیدا، چی لە زمانانی دەوروبەردا و چی لە ڕێزمانی زمانە ڕۆژئاواییەکاندا، وەك ئنگلیزی و فەرەنسی. لە ڕێزمانی کوردیدا، خۆمان جودا کردوەتەوە لە ڕێزمانی گشت زمانەکان و پەنامان بردوەتە بەر (تیۆری پلیکانەی ڕستە)، کە بریتیە لە ناوێنەی ڕستەسازی و وشەسازی کوردی. لە دەنگسازیشیدا، تیۆریەکمان داناوە، بە ناوی تیۆری زەبری بزوێن (Vowel Power Theory) و لە ئێرەیشدا خۆمان جودا کردوەتەوە و چەندین کتێبمان لە سەری بلاوکردوەتەوە، بە هەردوو زمانی کوردی و ئنگلیزی (بڕوانە بۆ پاشکۆی لیستی کتێبە بلاوکراوەکان). ئەمە و ئەوەی گوترا، لە (٣٦) کتێبدا بلاوکراوەتەوە و ئەم کتێبەی بەردەستیش بریتیە لە کتێبی ژمارە (٣٧)، کە لە ساڵی کۆتایی (٢٠١٥)دا پێداچوونەوە و نۆژەنکردنەوەی لە سەر ئەنجامدراوە، بۆ ئەوەی لە سەرەتای ساڵی (٢٠١٦)دا بلاو بکرێتەوە. لە ساڵی (٢٠١٥)دا، هەشت کتێبمان بلاوکردوەتەوە و لە چڕنووکی مەرگ و نەمان دەربازمان کردوون. ڕەنگە هەندێك کەس بڵێت: ئەم کارە بۆ ساڵێك زۆرە. نەخێر زۆر نیە، ئەو کتێبانە وادەی ئیشی دەیان ساڵی پێش ئێستان. واتە، ئێستا نۆژەنکراونەتەوە و نووسینەوەی دوەمیان بۆ کراوە. تەنانەت، پرۆژە و ئیشی ناوەهامان هەیە لە کۆتای ساڵانی هەفتادا دۆسیەی بۆ کراوەتەوە، بەلام تا ئێستا نەبوە بە (بابەت). بە ڕاستی، ئێمە لە لای خۆمانەوە و لە ماڵی خۆماندا بە دامەزراوەیی ئیش دەکەین و هەموو کاتێك خەریکی نۆژەنکردنەوەی پرۆژەکانین، تا بە شێوازێکی کاریگەرتر و ساناتر

بتوانێت بڕنجێته نێو چوارچێوەی توێژینەوەی زانستی. بە ئەو هیوایەی كە سەدەكانی داهاتوودا ناوەندەكانی توێژینەوەی زمانی كوردی دەست پێ بكات و ئەوسا ئەم نیشانە بكەونە بەر برەو.

لە لایەكی ترەوە، بەشێكی زۆر لە ئەم كتێبە تەرخانكراوە بۆ ڕێزمانی هەردوو كاری (كردن) و (دان). ئەو دوو كارەی كە دوو ناوەندێكی توێژینەوەی زانستیان بۆ دابمەزرێنیت و دەیان فوتابی دكتۆرایان لە سەر وەربگیرێن، هێژتا كەمە. ئەو دوو كارە زۆر زۆر بەپێز و بەبەرەكەتن لە ئاخاوتنی كوردیدا و باوەش دەكەنەوە بۆ گشت كێشە گەورەكانی ڕێزمان و دەنگسازی. لە ڕووبەرێكی تردا، ڕوومانكردوە لە كارەكانی دەنگی سروشتی، ئەو كارنەی كە مۆركی تایبەتی زمانی كوردی هەڵ دەگرن. لە لایەكی ترەوە، گەوتووینەتە وێزەی (كاری ئاراستەدار) و (كاری ئامرازدار). بە ڕاستی، ئەو جۆرە بابەتە و بابەتەكانی تری ئەم كتێبە شایستەی ئەوەن كە لە سەریان بوەستین و مافی خۆیان پێ ببەخشین لە توێژینەوەی زمانەوانیدا. لە كۆتاییدا، كورد گوتەنی: (بە كێ دەڵێیت؟). لە ئێستادا (٢٠١٥/١١/٢٩)، بە ئەم تەنیاباڵیە، ئێمە هەر ئەوەندەمان پێ دەكرێت بیروبۆچوونەكان دەرباز بكەین لە نەمان و بلاویان بكەینەوە.

# بابەتی یەکەم

# هەندێك لە سیما ڕێزمانیەکانی (کار)

## ١/١: دەستپێك:

لە بەر ئەوەی لە ڕێزمانی کوردیدا، ڕێزمانی (کار) زۆر گران و ئاڵۆزە، پێویست بە ئەوە دەکات کە هەندێك لە ئاکارە دژوارەکانی تۆمار بکەین. واتە، ئەو ئاکارانەی کە پەیوەندیان بە ئەو تایبەتمەندیانەوە هەیە کە لە ڕێزمانی کاردا بەرجەستەن. لە گەڵ ئەوەیشدا ڕێزمانی (کار) زۆر ڕێسادار و سفتە و هەندێك لە ئەو ئاکارانەیش بریتیە لە:

**یەکەم**: ڕوخساری ڕێژەی (کار): واتە، درێژبوونەوەو کورت بوونەوەی فۆرمی کار، بە پێی بەکارهێنان.

**دوەم**: ڕیزبەندی (کار) لە پلیکانەی ڕستەدا: واتە، ڕیزبەندی (کار) لە گەڵ (بکەر) و (بەرکار)دا.

**سێیەم**: کێشەی پەڕاندنی (بکەر) لە ڕستەدا: واتە، ڕستەی زمانی کوردی دەتوانێت (بکەری جودا) ببەزێنێت و (بکەری لکاو) بەکار بهێنێت.

**چوارەم**: باری دەرکەوتنی (بکەر) و (بەرکار) لە ڕستەدا: لە ئەم ڕووەوە، جیاوازیەکانی (بکەر) و (بەرکار) دەردەخەین. واتە، بکەر بە چەشنێك و بەرکار بە چەشنێکی تر دەردەکەون لە ڕیزی ڕستەدا.

لەکۆتایی ئەم نووسینەدا، پوختەیەك پێشکەشکراوە و گشت ئەو کێشانە ڕیزکراون.

## ٢/١: ڕوخساری کار:

ڕوخساری کار بریتیە لە (بیچمی کار)، یان لە ئەو فۆرمەی کە واتای کار هەڵ دەگرێت و دەشێت ڕستەیەکی ڕێزمانی چێ بکات. بۆ نموونە, ئەم فۆرمانەی خوارەوە بریتین لە ڕوخساری (کار).

- گرت(ت)
- دە (ت) گرت
- هەڵ (ت) دەگرت
- نامەکە (ت) هەڵ دەگرت
- نە (ت) دەگرت
- هەڵ (ت) نەدەگرت

.......................

بە سەرنجێکی ژیرانە، دەردەکەوێت کە چەند سیمایەك هەیە لە نێو ئەو ڕوخسارانەدا:

**یەکەم**: سیمای (سرکایەتی) لە ئارادایە، چونکە ڕوخسارەکان سرکن و دەجووڵێن. واتە، دەشێت ڕوخساری کارێکی کورت بەرەو درێژتر بڕوات، وەك:

| | |
|---|---|
| گرت | دەت گرت |
| | نەت دەگرت |
| | هەڵت نەدەگرت |
| | نامەکەت هەڵ نەدەگرت |
| | ................ |

یان دەشێت بەرەو کورتتر بڕوات، وەك:

| | |
|---|---|
| نامەكەت هەڵ نەدەگرت | نامەكەت هەڵ دەگرت |
| | نامەكەت هەڵ نەگرت |
| | نامەكەت هەڵ گرت |
| | هەڵت گرت |
| | گرتت |

كەواتــە، ڕوخســاری كــار ســیمایەكی ئەندازیانــەی تێدایــە و ســرکایەتی (flexibility) دەنوێنێت. چی بە (ژمارەی دەنگەكان) و چـی بـە ژمـارەی (مۆرفیمـەكان)، وەك:

| نموونە | ژمارەی مۆرفیمەكان |
|---|---|
| گرتت | ٣ + (جێناوی نادیار) |
| دەت گرت | ٤ + (جێناوی نادیار) |
| نەت دەگرت | ٥ + (جێناوی نادیار) |
| هەڵت نەدەگرت | ٦ + (جێناوی نادیار) |
| نامەكەت هەڵ نەدەگرت | ٦ + (بەركار) |

كەواتە، هەتا كار درێژ ببێتەوە بە ژمارەی (دەنگ). ئەوا ڕستەكە ڕازاوەتر دەبێت بە ژمارەی ئەو مۆرفیمە ڕێزمانیانەی كە ڕستەكە فراوانتر و ڕەنگینتر دەكەن بە (واتا).

<u>**دووەم**</u>: بە پێی خاڵی یەكەم. سیمای سرکایەتی لە ئارادایە و ڕوخساری كار سرکە و دەشێت بۆ هەر بەكارهێنانێك ڕوخسارێكی هەبێت. بەرانبەر بە ئەم بۆچوونە، دەشێت بپرسین:

## ئایا کورتترین و درێژترین ڕوخسار کامانەن و بۆچی؟

لە وەڵام دا، دەتوانین بڵێین لە دەمکاتی ڕابردوودا، نموونەی (گرتت) بریتیـە لـە کورتترین ڕوخسار. چونکە:

١ـ بە هیچ جۆرێك درێژ نابێتەوە لە ناوەوە، مەگەر بە چەواشەیی بکرێت بە {گرت (یش)ت}.

٢ـ ئەو ڕێژە کورتە وەك بنەڕەتی تەلارێك وایە، کە گشت نەۆمەکانی تر هەڵ دەگرێت. بۆ نموونە، ڕوخساری (گرت) لە گشت نموونەکانی تردا بریتیە لە بەردی بناغە.

٣ـ کەرەستەکانی تر، وەك (دە، نە، هەڵ، بەرکار)، ئەو نهۆمانە پێك دەهێنن کە لە سەر بەردی بناغە (گرت) بنیاد دەنرێن. بە ئەم پێیە، درێژترین ڕوخساری (کار) بریتیـە لـە ئەو فۆمەی کە (بەرکاری جودا) هەڵ دەگرێت، بۆ نموونە، وشەی (نامەکە) بوە بە دوا نهۆم و لە ئەوە بترازێت، لە سنووری (قەوارەی کار) دەردەچین و دەچینە سنووری قەوارەی (بکەر)، کە (گرێی ناوی) یە.

٤ـ دەتوانین گشت ڕوخسارەکان، بەپێی درێژی، ڕیز بکەین:

- **کورتترین: (گرتت) ← بناغە**
- **درێژتر: (دەت گرت) ← بناغە + یەك نهۆم**
- **درێژتر: (نەت دەگرت) ← بناغە + دوو نهۆم**
- **درێژتر: (هەڵت نەدەگرت) ← بناغە + سێ نهۆم**
- **درێژتر: (بۆ ئەوت هەڵ نەدەگرت) ← بناغە + چوار نهۆم**
- **درێژترین: (نامەکەت بۆ ئەو هەڵ نەدەگرت) ← بناغە + چوار نهۆم + دوا نهۆم**

<u>سێیەم</u>: ئەو کەرەستانەی کە ڕوخساری کار درێژ دەکەنەوە، ڕیزبەندیەکی لۆجیکی دەنوێنن. واتە، ناشێت (پاش و پێش) بکرێن. بۆ نموونە، ئەگەر ڕستەی (گرتت) بکەین بە خاڵی بنچینە (سفر)، ئەوا کەرەستەی ڕێزمانیەکان بە ئەم چەشنە ڕیز دەبەستن:

١. نزیكترین لە (گرت) : پێشكاری (دە)

٢. دوورتر : پێشكاری نەرێ (نە)

٣. دوورتر : پێشكاری (واتاگۆڕ)

٤. دوورتر : پێشكاری ئامرازی پەیوەندی (بۆ)

دوورترین لە (گرت) : پێشكاری (بەركار)، (نامەكە)

**٣/١: ڕیزبەندی كار لە ڕستەدا:**

وەك زمانی كوردی ڕیزبەندی نێوان كۆڵكەكانی ڕستە بە ئەم چەشنە دەپارێزێت: **(بكەر، پاشان، بەركار، پاشان، كار)**, دەتوانین ڕیزیان بكەین لە ژێر هێمای (SOV)دا، وەك دەخوێنرێتەوە بە (سۆڤ)، یان بە (ئێس ـ ئۆ ـ ڤی). لە ئەم زاراوەیەدا، هێمای (S) دەگەڕێتەوە بۆ بكەر (Subject)، هێمای ئۆ (O) دەگەڕێتەوە بۆ بەركار (Object) و هێمای (V) دەگەڕێتەوە بۆ كارەكەی نێو ڕستەكە (Verb). لە نەخشەی (١/١)دا، چەند نموونەیەك ڕیز دەكەین, بە ئەو هیوایەی بتوانین بە پێی بنەمای سۆڤ (SOV) بابەتەكە لە خشتبڕ بدەین:

| بكەر (S) | بەركار (O) | كار (V) |
|---|---|---|
| من | نان | دەخۆم |
| تۆ | نانت | خوارد |
| منداڵەكان | — | هاتن |
| ئێوە | نامەكەتان | بردوە |
| ئێمە | ئێوە | ناناسین |
| من و شیلان و ئازاد | ئیشەكانی ئێوە | جێ بەجێ دەكەین |
| من و تۆ | باوڵەكەمان | هەڵ گرتبوو |
| دەرگای پۆلەكە | — | كرایەوە |
| ئێمە | (؟) | نەمان دەنارد |
| ئەوان | هەستی خۆیان | دەردەبڕن |

نەخشەی (١/١): ڕیزبەندی كۆڵكەكانی ڕستە (سۆڤ)

لە ئەو نەخشەیەدا، لە كاری تێنەپەڕدا، ریزبەندی (SOV) دەگۆڕێت و (SV) لە بەر ئەوەی كۆڵكەی (بەركار) لە ئارادا نیە. هەندێك جاریش لە ڕێژەی تێپەڕدا، (بەركاری جودا) دەبێت بە (بەركاری لكاو)، بەڵام وا بە ئاسانی بزر نابێت.

سەرەڕای ئەوەی گوترا، چەند سەرنجێك هەیە لە ئاستی ئەم پۆلێنكردنە، وەك:

**یەكەم**: لە زمانی كوردیدا، دەشێت بكەری ڕستەكە لابردرێت، وەك:

**١. كاری تێپەڕ:**

**من نامە دەنووسم: (SOV)**

**ـ نامە دەنووسم: (-OV)**

**دووەم**: لە زمانی كوردیدا، بكەری ڕستەكە نوێنەری هەمیشەیی هەیە لە قەوارەی كاردا. ئەو نوێنەرە بە (جێناوی لكاو) دەردەبڕدرێت و دەلكێت بە كارەكەوە. بۆ نموونە، جێناوی (م) بریتیە لە ئەو نوێنەرە هەمیشەییە و لە هەر چوار ڕستەكەدا هەیە. هەر لە بەر ئەوە, دەشێت پیتی (ئێس)ی بچووك (s) بلكێنین بەكارەكەوە، وەك: (من نامە دەنووسم ← نامە دەنووسم) بە هێمای **(SOVs → - OVs)**.

## ٤/١: زمانێكی بكەربەزێن (Prodropy)

لەرستەی زمانی كوردیدا دیاردەی (پرۆ درۆپی)، یان (بكەربەزێنی) زۆر بەربلاوە و گشت ڕستەكانی زمانەكە دەتوانن (بكەری جودا) ببەڕێنن، یان ببەزێنن و بەبێ (بكەر جودا) دەربكەون، وەك:

**(ئێمە) (نان) (دەخۆین) $SOV_s$**

**(ـ) (نان) (دەخۆین) $-OV_s$**

هۆی ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی كە (بكەری لكاو) بریتیە لە (نوێنەری هەمیشەیی)ی (بكەری جودا) لە (قەوارەی كار)دا، یان لە (گرێی كاری)دا، وەك:

(ئێمە)$^{S}$ (نان)$^{O}$ دەخۆ$^{V}$ (ین)$^{s}$ ← $SOV_5$

(ـــ) (نان)$^{O}$ دەخۆ$^{V}$ (ین)$^{s}$ ← $-OV_5$

لە ئەو دوو رستەیەدا، بكەری (ئێمە)، بە (هەبوون) و (نەبوون) لە ریزی رستەكەدا، نوێنەری بەردەوامی هەیە. بێگومان ئەو نوێنەرە بریتیە لە بكەری لكاو (ین) لە هەردوو رستەكەدا، كە هێمای (S)ی بچووكی بۆ زیادكراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك جیاوازی و بەراورد هەیە لە نێوان هەردوو جۆرەكەی بكەردا، وەك:

**یەكەم: بكەری جودا:**

١. بكەری جودا قەوارەی تایبەتی خۆی هەیە و بە گرێی ناوی چێ دەبێت.

٢. بكەری جودا بە جێناوی جودا (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان) دیاری دەكرێت. دەشێت لە جیاتی (ئەو، ئەوان) ناو بەكار بهێنرێت یان دەشێت (ناو) و (جێناو) تێكەڵ بكرێت، وەك:

**(من و ئازاد و پاسەوانەكە) میوە دەخۆین**

٣. بكەری جودا، دەكەوێتەبەر دیاردەی پرۆدرۆپی (بكەربەزاندن)، وەك:

**(ـــــــ) میوە دەخۆین**

**دووەم: بكەری لكاو:**

١- بكەری لكاو قەوارەی سەربەخۆی نیە و دەلكێت بە كلكی كاردوە.

٢- بكەری لكاو تەنها و تەنها هەر بە (جێناوی لكاو) ڕیز دەكرێت، وەك:

- (م، یت، ێت، ین، ن، ن)
- (م، ت، ی، مان، تان، یان)

٣- بكەری لكاو بە هیچ جۆرێك ناكەوێتە بەر دیاردەی (پرۆدرۆپی). واتە. ئەو جۆرە بكەرە لكاوە بریتیە لە نوێنەری (بكەری جودا) لە قەوارەی (كار)دا. یان لە پانتایی (گرێی كاری)دا.

٤- دەشێت لە نەخشەی ڕستەیەكدا هەردوو (بكەری جودا) و (بكەری لكاو) لە یەكتری جودا بكەینەوە. وەك:

| بكەری جودا | .............. | بكەری لكاو |
|---|---|---|
| من | نان دەخۆ | (م) |

زاراوەی (جودا) و (لكاو) لە ئاستی (بكەری ڕستە)دا. لە ئەو ڕاستیەوە وەرگیراوە. كە (بكەری جودا) بە (جێناوی جودا) ڕیز دەبێت و (بكەری لكاو)یش بە (جێناوی لكاو) ڕیز دەبێت.

### ٥/١: ڕەفتاری كۆلكەی بەركار:

لەزمانی كوردیدا. (بەركار)ی ڕستە دوو دیوی هەیە و ئەو دوو دیوە هەر یەكێكیان بۆی هەیە كە لە یەك ڕستەدا ئامادەبێت. وەك:

**من (تۆ) دەنێرم**

**من دە (ت) نێرم**

لە جۆری یەکەمدا، دەشێت بەرکارەکە (تۆ) بە (بەرکاری جودا) ناو ببردرێت، چونکە بە جێناوی جودا (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان) ڕۆدەنرێت. لە جۆری دووەمدا، دەشێت بەرکاری (ت) بە (بەرکاری لکاو) ناو ببردرێت، چونکە بە (جێناوی لکاو) ڕۆدەنرێت. ڕێزمانی ئەم دوو بەرکارە، وەك ڕێزمانی (بکەر) نیە و تەنها هەر یەکێکیان لە ڕستەدا بۆی هەیە ئامادە ببێت و ئەگەر هەردوویان ئامادەبوون. وەك:

**من (تۆ) دە (ت) نێرم(*)**

ئەوا زمانەکە دەبزڕکێت(*). لە هەمان ڕستەدا، دەشێت هەردوو (بکەری جودا) و (بکەری لکاو) ئامادەبن بەیەکەوە:

| بکەری جودا | | بکەری لکاو |
|---|---|---|
| من | تۆ دەنێر | (م) |

کەواتە، ڕێزمانی (بکەر) جیاوازە لە ڕێزمانی (بەرکار)، کەچی هەردووکیان دیوی (جودا) و دیوی (لکاو)یان هەیە. لە گەڵ هەموو ئەوەیشدا، ئاکارێکی تر هەیە لە ئاستی (بەرکار)دا، وەك:

ـ لە دەمکاتی ڕانەبردوودا، ڕستەکە بۆی هەیە دەرباز ببێت لە (بەرکاری لکاو) و لە (بەرکاری جودا) پێکەوە:

١ـ بەبێ بەرکاری جودا و بەبێ بەرکاری لکاو:

**من (ـ) دەخۆم**

٢ـ بە (بەرکاری جودا):

**من (نان) دەخۆم**

٣ـ بە (بەرکاری لکاو):

من دە (ی) خۆم

ـ لە دەمکاتی رابردوودا، رستەکە بەهیچ جۆرێك دەرباز نابێت لە (بەرکار) و گشت کاتێك بەرکارێك هەیە لە ریزەکەدا. ئێستایش، لە سەر نەخشەی (٢/١) گشت بارەکانی دەرکەوتنی (بەرکاری جودا) و (بەرکاری لکاو) دەخەینەڕوو، وەك:

| باری (بەرکار) | رانەبردوو و فەرمان | رابردوو |
|---|---|---|
| بێ بەرکاری | من دەخۆم<br>تۆ بخۆ | ـــــ<br>ـــــ |
| بەرکاری جودا بە تەنها | من (نان) دەخۆم<br>تۆ (نان) بخۆ | من (نان)م خوارد<br>ـــــ |
| بەرکاری لکاو | من دە (ت) نێرم<br>تۆ بـ (ی) خۆ | من ناردم (یت)<br>ـــــ |
| بەرکار جوداو بەرکاری لکاو پێکەوە | ـــــ | ـــــ |

نەخشەی (٢/١): بارەشیاوەکانی بەرکاری جودا و بەرکاری لکاو

لە ئەو نەخشەیەدا، چەند خانەیەك بە بۆشی دەمێنینەوە، چونکە لە (رێزمانی بەرکار) دەردەچن. لە گەڵ ئەوەدا، رێژەی (رانەبردوو) و رێژەی (فەرمان) بەیەکەوە ریزکراون، چونکە هەردوو بابەتەکە یەك رێزمانیان هەیە لە ئاستی (بەرکار)دا. لە سەر نەخشەی (٣/١)، هەمان بیر و بۆچوون لە ئاستی (رێزمانی بکەر)دا دووبارە دەکەینەوە:

| باری بكەر | ڕانەبردوو و فەرمان | ڕابردوو |
|---|---|---|
| بێ بكەر | ــــــ | ــــــ |
| بكەری جودا بە تەنها | ــــــ | ــــــ |
| بكەری جودا و بكەری لكاو | (من) دەخۆ (م) | (من) خوارد (م) |
| پێكەوە | (تۆ) بخەو (ە) | ــــــ |
| بكەری لكاو بە تەنها | ـ دەخۆ (م) | ـ خوارد (م) |
| | ـ بخەو (ە) | ــــــ |

نەخشەی (٢/١): گشت بارەكانی دەركەوتنی (بكەر)

لە ئەو نەخشەیەدا، دەردەكەوێت كە ڕێزمانی (بكەر) بە تەواوەتی جیاوازە لە نیمچە ڕێزمانی (بەركار)، چونكە دەركەوتنیان جیاوازە.

## ٦/١: بەرەنجام و پوختەكاری:

**یەكەم**: ڕوخساری (كار) بۆی هەیە كورت ببێتەوە، یان درێژ ببێتەوە. لە ڕابردوودا، كورتترین فۆرمی كار بریتیە (گرت) لە (گرتم)دا و درێژترین فۆرمی قەوارەی كار بریتیە لە (نامەكەم| بۆ تۆ| هەڵ| نە|دە|گرت).

**دووەم**: كورتترین فۆرمی كار (گرت) بریتیە لە ژێرخانی ڕستە و ئەو فۆرمە چینی بنەڕەت دروست دەكات بۆ ڕستەی درێژتر.

**سێیەم**: درێژی فۆرمە سركەكەی (كار) دەشێت بە (ژمارەی مۆرفیمەكان) بپێورێت.

**چوارەم**: ڕەگەزە ڕێزمانیەكانی نێو ڕوخساری (كار) ڕیزبەندی خۆیان دەپارێزن و پلیكانەیەكی لۆجیكی دروست دەكەن.

**پێنجەم**: زمانی كوردی سیمای ڕیزبەندی (بكەر، پاشان، بەركار، پاشان، كار) دەپارێزێت. ئەم ڕیز بەندیە بە سۆڤ (SOV) ناسراوە.

**شەشەم**: زمانی كوردی زمانێكی بكەر بەزێنە (Pro-drop language). هۆی ئەمە

دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی دوو (بكەر) لە رستەدا. بكەرێكی جودا لە دەرەوەی قەوارەی (كار) و بكەرێكی لكاو لە ناوەوەی قەوارەی (كار). لە ئەم دیاردەیەدا، ڕێسای (بكەربەزێنی) هەر (بكەری جودا) دەگرێتەوە، نەك (بكەری لكاو).

**هەفتەم**: وەك رستە ناتوانێت لە (بكەر) دەربازببێت. بەڵام دەتوانێت لە (بەركار) دەرباز ببێت. لە ڕانەبردوودا، ڕێژەی كاری تێپەڕ دەشێت لە بەركار (چی جودا و چی لكاو) دەرباز ببێت.

**هەشتەم**: دەشێت (بكەری جودا) و (بكەری لكاو) پێكەوە لە یەك رستەدابن، بەڵام (بەركاری جودا) و (بەركاری لكاو) بۆیان نیە بەیەكەوە لە یەك رستەدا بن.

### ٧/١: بەرەنجامی پێشكەوتوو:

- وەك زمانی كوردی (سیستمی ئەكیووزەتیڤ) پەیڕەو دەكات (لە دەمكاتی ڕانەبردوودا)، رستەكە بۆی هەیە دەرباز ببێت، چی لە (بەركاری لكاو) و چی لە (بەركاری جودا). واتە، لە ئاستی بەركاردا، رستەی ڕانەبردوو بۆی هەیە سێ باری شیاو بنوێنێت لە رستەسازیدا، وەك: (بەبێ بەركار، بە بەركاری جودا، بە بەركاری لكاو)، وەك (دەنووسین، نامە دەنووسین، دەی نووسین).
- لە دەمكاتی ڕابردوودا سیستمی رستەكە دەگۆڕێت و دەبێت بە (ئێرگەیتیڤ). بەو هۆیەوە، رستەی ڕابردوو بە هیچ جۆرێك دەرباز نابێت لە (بەركار) و گشت كاتێك بەركارێك هەیە لە ڕیزەكەدا، تەنانەت، ئەگەر بەركارێكی (نادیار)یش بێت (بەرانبەر بە كەسی سێیەمی تاك). كەواتە، رستەی (ڕابردوو) بۆی هەیە دوو باری شیاو بنوێنێت لە رستەسازیدا، وەك: (بە بەركاری جودا، بە بەركاری لكاو)، وەك (تۆمان دەبرد، دەمان نووسیت).
- وەك درێژەیەك، یان وەك تیرۆژەیەك بۆ خاڵی پێشوو، لە ئاستی (بەركاری لكاو)دا، دوو باری شیاو هەیە، وەك (بە جێناوی دیار، بە جێناوی نادیار)، بە نموونەی (دەمان بردیت، دەمان برد).

**سەرچاوە:**

- د. شێركۆ بابان، ڕستەسازی و شیتەڵكاری زانستی، هەولێر، ١٩٩٦.

- د. شێركۆ بابان، نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی كار، هەولێر، ١٩٩٩.

- محەمەد مەعروف فەتتاح، كار پۆلین كردن بەپێی ڕۆنان، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، بەغدا، ١٩٨٩.

- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی كوردی، وشەسازی، كردار، بەغدا، ١٩٧٧.

- J. Aitchison, Linguistics, Hodder and Stoughton, U. K 1992.

## بابەتی دووەم

## کاری (کردن) یان دیوە تێپەڕەکەی کاری بوونی ڕووداودار

### ١/٢: دەستپێك:

لە گشت جێیەکدا و لە گشت نووسینێکدا، ئێمە بایەخێکی چڕ و پڕمان داوە بە ڕێزمانی (بوون و هەبوون)، تا ئێستاش بابەتەکە لە نێو بیری ئێمەدا کوڵ دەدات و لە هەر کوڵدانێکدا ڕووبەرێکی دیکە دەدۆزینەوە. هەر لە بەر ئەوە، ئێمە وا هەست دەکەین، کە ڕێزمانی (بوون و هەبوون) بریتیە لە ئەو بناغەیەی کە بۆ تەلاری ڕێزمانی زمانەکەمان پێویستە. لە م نووسینەدا، دەست دەبەین بۆ بابەتێکی زۆر سەیر و زۆر دەگمەن، کە بریتیە لە کاری (بوون: کردن) و (بوون بە...: کردن بە...). بە واتایەکی دی، کاری (کردن) ڕەسەن نیە و بریتیە لە دیوە تێپەڕەکەی کاری (بوون) یان (بوون بە .....). بە شێوەیەکی دی، ئەگەر لە ڕووی هێزی تێپەڕینەوە، کاری (بوون) یەکسان بێت بە (سووتان)، ئەوا کاری (کردن) یەکسان دەبێت بە (سووتاندن). ئەمەیش وا دەکات کە بڵێین: کاری (بوون) و کاری (بوون بە ...) بریتین لە (کوانوو) و لە (بنج) بۆ هەر دوو کاری تێپەڕ (کردن) و (کردن بە ...). بیرۆکەی ئەم نووسینەیش لە ڕاستیەکەوە سەرچاوە دەگرێت، کە دکتۆر نەسرین فەخری دیاری کردووە لە بۆ واتای کاری (کردن)، بەرانبەر بە کاری (جعل) لە زمانی عەرەبیدا. لە ڕاستیدا، ئەم بیرۆکە جوان و بەکار و کاریگەرە بوو بە ئەو کلیلەی کە توونێلەکانی نێوبیری ئێمە بکاتەوە. بێگومان، لە ئەو سەرەتا بچووکەوە، تەواوکەرێکی بە هێزمان دۆزیەوە بۆ ئیشەکانی خۆمان لە ڕێزمانی (بوون و هەبوون) دا و ئەو تەواوکەرە بوو بە هۆکارێك بۆ بنیادنانی چەند چینێکی دیکە لە سەر بنەڕەتی ئەو بیرۆکە وردە. لە گەڵ ڕێز و سوپاسدا بۆ مامۆستای گەورە و بەڕێز (د. نەسرین فەخری).

## ٢/٢: بنچینەی کاری (کردن).

ئێمە لە زۆر جێدا گوتوومانە کە کاری (بوون) بریتیە لە (کوانوو)ی کاری (کردن) و بە دیاری کراویش کاری (بوونی بوونایەتی) و کاری (بوون بە ...)، وەك لە نەخشەی (١/٢)دا بە زولاڵی روونکراوەتەوە, بەڵام چەند خاڵێك هەیە بۆ چاوخستنەسەر, وەك:

| بوونی بێ رووداو | | بوونی بە رووداو | |
|---|---|---|---|
| بوونی ئێستایی | هەبوون | بوونی بوونایەتی | بوون بە .... |
| من مامۆستا (م) | من هەم | من جوان دەبم | من دەبم بە چاودێر |
| تۆ مامۆستا (یت) | تۆ هەیت | تۆ جوان دەبیت | تۆ دەبیت بە چاودێر |
| ئەو مامۆستای(ـە) | ئەو هەیە | ئەو جوان دەبێت | ئەو دەبیت بە چاودێر |
| | | کێ من جوان دەکات؟ | من دەکەن بە چاودێر |
| | | کێ تۆ جوان دەکات | تۆ دەکەن بە چاودێر |
| | | کێ ئەو جوان دەکات؟ | ئەو دەکەن بە چاودێر |

نەخشەی (١/٢): بوونی بوونایەتی و کاری (کردن) بە بەراورد

**یەکەم**- جۆرەکانی (بوونی ئێستایی) و (هەبوون) پەیوەندی راستەوخۆیان نیە بە کاری (کردن)ەوە.

**دووەم**- بە جوانی و بە سفتی دەرکەوتوە کە نموونەکانی (بوونی بوونایەتی) و (بوون بە ...) لە دیوی تێپەڕدا دەبن بە ڕێژەی کاری (کردن) و کاری (کردن بە ...).

**سێیەم** دەشێت (بکەرنادیار)ی کاری (کردن) بەکار بهێنین بۆ ئەوەی تەمومژەکە بە شێوەیەکی کاریگەرتر بڕەوێنینەوە. وەك:

کاری بوونی بوونایەتی:

من جوانم (دەبم): شیلان من جوان (دەکات): من جوان (دەکرێم)

کاری (بوون بە ...):

من دەبم بە چاودێر: شیلان من دەکات بە چاودێر: من دەکرێم بە چاودێر

كەواتە، دەردەكەوێت كە خزمایەتیەكی پتەو هەیە لە نێوان كاری (بوون) و كاری (كردن)دا. لە كۆتایی ڕێگاكەیشدا، دەتوانین بڵێین: هەردوو كاردكە بریتین لە دوو (دیو)ی (تێنەپەڕ و تێپەڕ) بۆ یەك (كار) و ئەو كارەیش بریتیە لە (بوون: كردن).

**چوارەم**- ئەگەر نموونەكانی نێو خالّی پێشو بە (چاوگ) بنووسین، دەبینین كە ئەم ڕێزبوونە هەیە:

جوان بوون: جوان كردن: جوان كران

بوون بە ... : كردن بە ... : كران بە ...

**پێنجەم** ئەو نموونانەی كە لە خالّی پێشوو باسكران، دەشێت بكرێن بە خشتەیەك بەپێی (هێزی تیپەڕین) و بە پێی (بكەرنادیاری)، ئەخشەی (٢/٢).

| تینەپەڕ | تیپەڕ | تێنەپەڕ (بكەرنادیار) |
| --- | --- | --- |
| جوان بوون | جوان كردن | جوان كران |
| بوون بە ... | كردن بە ... | كران بە ... |

نەخشەی (٢/٢): سووڕی كاری (بوونی ڕووداودار) لە ڕستەسازیدا

## ٣/٢: خزمایەتی كاری (بوون) و كاری (كردن):

بێگومان لە شوێنێكدا كە ڕێژەی كەسی سێیەمی تاك مۆرفیمی ئێستایی ([redacted]) وەربگرێت، وەك (ئەو كچە شیلان[redacted]) و (شیلان هەی[redacted])، ئەوا كاری (بوونی بێ ڕوودان) لە ئارادایە. لە هەر شوێنێكیش ئەو مەرجە نەچەسپێت ئەوا كاری (بوونی ڕووداودار) لە ئارادایە، ئەم كارەیش بریتیە لە (كوانوو)ی كاری (كردن). بۆ نموونە، دەشێت چەند نموونەیەك شی بكەینەوە كە ڕێژەی (بوون) هەڵ دەگرن، وەك:

شیلان چەند قەڵەو (بوو)ە!

جاران شیلان قەڵەو (بوو)!

شیلان نامەی نووسی (بوو)

ئەگەر ئەم سێ نموونەیە بکەین بە (رانەبردوو)، ئەوا جیاوازی دەردەکەوێت، وەك:

شیلان چەند قەڵەو دەبێت

ئێستا شیلان قەڵەو(ە)

شیلان نامە دەنوسێت

لە نموونەی دوەمدا مۆرفیمی ئێستایی (ە) دەرکەوتوە. کەواتە, ئەو نموونەیە ناگەڕێتەوە بۆ کاری (کردن)، لە نموونەی سێیەمدا، کاری (بوون) لە ئارادا نەماوە و هەر کاری (نووسین) دەرکەوتوە . کەواتە ئەو (بوو)ەی کە نووساوە بە کاری (نووسین)ەوە, بە رۆنان پێی گەیشتوە و ئەمەیش خۆی نیە. لە نموونەی یەکەمدا کاری (بوونی بوونایەتی) هەیە، وەك (دەبێت) و مۆرفیمی ئێستایی دەرنەکەوتوە . کەواتە ئەم نموونەیە بریتیە لە (بوون: کردن) وەك:

بوون:

شیلان چەند قەڵەو (بوە)

کردن:

زۆر خواردن شیلانی چەند قەڵەو (کردوە)

بە سەرنجێکی ورد لە ئەو دوو ڕستەیە, دەردەکەوێت کە دوو چاوگی خزم بەرانبەر بە یەکتری دەوەستن، وەك (قەڵەو بوون: قەڵەو کردن) و ئەگەر ئاوەڵناوی (قەڵەو) لاببەین ئەوا کاری (بوون: کردن) ئاشکرا دەبێت.

## ٤/٢: ناسینەوەی کاری (بوون: کردن):

لە نێو ڕێزمانی کوردیدا چەند ئامێرێك هەیە بۆ ناسینەوەی ڕێژەکانی (بوون: کردن) بەئەم چەشنە:

**یەکەم:** وەك لە کۆپلەی پێشوودا باسکرا، ئەگەر لە ڕێژەی (ڕانەبردوو)دا مۆرفیمی ئێستایی (ە) دەرکەوت بەرانبەر بە کەسی سێیەمی تاك, ئەوا کاری (بوون: کردن) لە ئارادا نیە.

**دووەم:** ئەگەر ڕستەکە لە ڕێژەی ڕانەبردوودا بە نیشانەی (نی) بوو بە (ڕێژەی نەرێ)، ئەوا کاری (بوون: کردن) لە ئارادا نیە.

**سێیەم:** ئەگەر ڕەگەزی (هە)ی (هەبوون) هەبوو لە ڕیزەکەدا ئەوا کاری (هەبوون) لە ئارادایەو کاری (هەبوون)یش پەیوەندی نیە بە کاری (بوون: کردن)ەوە.

ئەو بەڵگانەی سەرەوە دەی سەلمێنن کە کاری (بوون: کردن) لە ئارادا نیە، بەلام هەندێك بەڵگەی دیکە هەیە, بە پێچەوانەوە دەی سەلمێنن کە لە ئارادا هەیە, وەك:

**یەکەم:** ئەگەر ئامرازی پەیوەندی (بە) هەبوو لە ڕیزەکەدا, ئەوا کارەکە بریتیە لە (بوون بە ...) و ئەو کارەیش لە سەرتاسەری زمانەکەدا وەردەچەرخێت بۆ (کردن بە ..).

کەواتە، لە جۆرە ڕێژەی ئاوهادا, کاری (بوون بە ...: کردن بە ...) لە ئارادایە و گفتوگۆ پەسەند ناکات، وەك:

ئەم ئاردە چۆن (بوو) بە نان؟

کێ ئەم ئاردەی (کرد) بە نان؟

ئەم ئاردە چۆن (کرا) بە نان؟

**دووەم:** لە هەر شوێنێكدا ڕێژە لێڵەكە ئامرازی پەیوەندی (ە)ی هەلگرتبێت، ئەوا هەمان بۆچوونی نێو خاڵی پێشوو دەچەسپێت وەك:

ئەم ئاردە چۆن (بوو)ە نان؟

كێ ئەم ئاردەی (كرد)ە نان؟

ئەم ئاردە چۆن (كرا)یە نان؟

بەم پێیە چاوگی (بوون بە نان: كردن بە نان) گۆڕاوە بۆ ڕوخساری (بوونە نان: كردنە نان). بەلام ئێمە ئامرازی (بە) بە ڕەسەن دەناسین، نەك ئامرازی (ە). چونكە لە گشت شوێنێكدا كە (بوونە نان: كردنە نان) هەبێت، دەتوانرێت بگەڕێنرێتەوە بۆ سەر ڕەچەڵەكی خۆی، كە بریتیە لە (بوون بە نان: كردن بە نان)

**سێیەم:** لە بەر ئەوەی (بوونی ئێستایی) و (هەبوون) پاشگری دووپاتی (ەوە) وەرناگرن. لە هەر شوێنێك كە ئەو پاشگرە پەسەند بێت. ئەوا ڕێژە بەرمەبەستەكە لە گیرفانی (بوون: كردن)دایە، وەك:

ئەم ئاردە چۆن (بوو) بە نان؟

ئەم ئاردە چۆن (بووەوە) بە نان؟

بە پێی ئەو نموونەیە، دەشێت باندۆر و كاریگەریی پاشگری دووپاتی (ەوە) دەربخەین لە سەر چاوگەكان، نەخشەی (٣/٢).

| | بێ پاشگری (ەوە) | بەپاشگری (ەوە) |
|---|---|---|
| **بوونی بوونایەتی** | بوون: كردن | بوونەوە: كردنەوە |
| بوون بە ... | بوون بە .... كردن | بوونەوە بە .... كردنەوە بە ... |

نەخشەی (٣/٢): پاشگری دووپاتی (ەوە) لە (بوونی ڕووداودار)دا

**چوارەم:** لە بەر ئەوەی (بوونی ئێستایی) و (هەبوون) پێشكاری (واتاگۆڕ) وەرناگرن وەك (هەڵ، دا، ...) لە هەر ڕێژەیەكی شێلوودا دەركەوتنی ئەم بابەتە دەبێت بە بەڵگە كە كاری (بوون: كردن) لە ئارادایە وەك:

ئەو چرایە هەڵ بوە
ئەو چرایە هەڵ كراوە
كێ ئەو چرایەی هەڵ كردوە؟

لە ڕاستیدا ئەم بەڵگەیە تەنها چاوگی (بوون: كردن) دەگرێتەوە. نەك (بوون بە ...: كردن بە ...)، چونكە ئەمەی دوایی بە ئامرازی (بە) واتای گۆڕاوە و دووبارە ناتوانێت واتاگۆڕێكی دیكە وەربگرێت.

**پێنجەم:** بە پێی خاڵی سێیەم، چاوگێكی تری (بوون: كردن) هەیە، لە چەشنی (بوونەوە: كردنەوە)، بە واتای (فتح) لە زمانی عەرەبیدا.

### ٥/٢: پانورامایەك بۆ جۆرەكانی كاری (بوون: كردن)؛

كاری (بوونی ڕووداودار)، كە هەردوو كاری (بوون : كردن) و (بوون بە ...: كردن بە ...) دەگرێتەوە، چەندین ڕوخساری هەیە و ئەو ڕوخسارانە لە ڕووبەری زمانی ژێریدا ڕاوێشكە دەكەن، بەلاّم لە زمانی ڕێزمانیدا زۆر بێ نازن و زۆر بێ خزمەتن. لە گەڵ ئەوەشدا، كاری (بوونی ڕووداودار) بڕشت و بواری هەندە زۆرە و هەندە بەرزە، بە ڕادەیەك كە زۆربەی ڕووبەری ئاخاوتنی كوردی دەگرێتەوە. لە سەر نەخشەی (٤/٢)، پانۆرامایەك پێشكەش دەكەین بۆ گشت ڕوخسارەكانی كاری (بوونی ڕووداردار)، بەو هیوایەی كە خشتەكە گشت پەل و پۆكانی ئەو كارە گرنگە بگرێتەوە.

| | | بـــــوونی بوونایەتی | بوون بە ... |
|---|---|---|---|
| چاوگی سادە | تێنەپەڕ | بوون | بوون بە ... |
| | تێپەڕ | كردن | كردن بە ... |
| | بكەر نادیار | كران | كران بە... |
| چاوگی ناسادە | + پاشـــــگری (دوە) | بوونـــــەوە:<br>كردنـــــەوە:<br>كرانەوە | بوونەوە بە ..:<br>كردنەوە بە ..:<br>كرانەوە بە.. |
| | + واتـــــاگۆڕ (هەڵ) | هەڵبوونـــەوە:<br>هەڵكردنـــەوە:<br>هەڵكرانەوە | |
| | + ئاوەڵنـــــاو (جوان) | جوانبـــــوون:<br>جـــــوانكردن:<br>جوانكران | |
| | + پێشـــــگر (هەڵ)<br>+ پاشگر (دوە) | جوانبوونەوە:<br>جوانكردنەوە:<br>جوانكرانەوە | |

نەخشەی (٤/٢): پانۆڕامایەك بۆ ڕوخسارەكانی كاری بوونی ڕووداودار

## ٦/٢: پوختەكاری و بەرەنجام:

لەم پوختەكارییەدا نەختێك بە ڕژدی دەست دادەگرین و چەند خاڵێك تۆمار دەكەین، تا بتوانن ڕێزمانی كلاسیكی بهەژێنێن و چەند دەرگایەك بكەنەوە لە ئەو ڕووبەرانەدا كە مۆركی ڕەسەنایەتی هەڵ دەگرن، وەك:

١ كاری (بوون) و كاری (كردن) بریتین لە دوو دیو بۆ یەك كار، لە ئەو كارەدا، كاری (بوون) دیوی تێنەپەڕ دەنوێنێت و كاری (كردن)یش دیوی تێپەڕ.

٢ كاری بوونی (ڕووداودار) كە بە كاری (بوونی ڕوودان)یش ناوبراوە, لە دوو كار پێكهاتوە بریتین لە : (بوون : كردن) و (بوون بە ... : كردن بە ...).

٣- كاری (بوون) لە بنجیترین واتادا، ڕامانی (ڕوودان) دەگەیەنێت و لە پاشتردا كورتكراوەی (بوون) واتای (لە دایك بوون) دەگەیەنێت.

٤- كاری (بوون: كردن) دەتوانێت بابەتی (ئاوەڵناو) سەودا بكات و كارێكی نوی پەیدا بكات لە ئاستی هەر ئاوەڵناوێك, وەك (جوان بوون: جوان كردن).

٥- كاری (بوون بە ...: كردن بە ...) دەتوانێت (ناو)ێك سەودا بكات و دیاری بكات, وەك (بوون بە ئارد: كردن بە ئارد). لە دیوە تێپەڕەكەدا (كردن بە ئارد)، ڕێزمانەكە ڕێ دەدات (بەركار) وەربگرێت، وەك (هەویر كردن بە نان) یان (ئـاو كردن بە سەهۆڵ)

٦ كاری (بوون: كردن), نەك (بوون بە ...: كردن بە ...)، دەتوانێت پێشگری واتاگۆڕ (هەڵ، دا، ڕا، ڕۆ) وەربگرێت وەك (هەڵ بوون: هەڵ كردن)، (دابوون: دا كردن)، و (ڕۆبوون: ڕۆكردن)

٧- سەرپاكی جۆرەكانی كاری (بوونی ڕووداودار) بۆیان هەیە پاشگری دووپاتی وەربگرن، وەك (بوونەوە: كردنەوە) و (بوونەوە بە ... : كردنەوە بە...).

٨ ناوەڕۆكی خاڵی (٤) و خاڵی (٦) ناشێت بەیەكەوە بچەسپێن. واتە كاری (بوونی بوونایەتی) ناتوانێت (ئاوەڵناو) و (پێشگری واتاگۆڕ) پێكەوە سەودا بكات.

٩- كاری (بوون بە ...: كردن بە ...) ناتوانێت, نە (ئاوەڵناو) و نە (پێشگری واتاگۆڕ) سەودا بكات. هەر لە بەر ئەوە زۆر بە بەرتەسكی دەچێتە بەر چیكەنەی ڕستەسازی. ئەو كارە تەنها و تەنها هەر پاشگری دووپاتی (ەوە) وەردەگرێت، ئەویش بۆ دووبارە بوونەوەی ڕووداوی كارەكەی.

١٠- بە پێی ئەو خاڵانەی سەرەوە، دەتوانین بگەڕێینەوە بە ڕەگێشە و بە ڕەچەڵەك و

بە سەجەرەی نموونەکاندا، تا دەگەینەوە بە کاری بنجی (بوون).

١١ لەزمانی کوردیدا، کاری (بوونی ڕووداودار) بریتیە لە ئامێرێکی بلیمەت و چوست و بەکار و ڕاستەوخۆ بۆ چێکردنی کارێکی تازە بە جووتبوون لە گەڵ (ئاوەڵناو)ێك. وەك (جوان بوون: جوان کردن) بە واتای (تجمیل). بە داخەوە، ئەم ئامێرە بلیمەتە هەیە بۆ وشە ڕۆنان و بۆ گەردانامەیەکی یەکگرتوو و پڕ بە دەم. کەچی کەڵکمان لێ وەنەگرتوە و لە جیاتی ئەوە، دەست دەبەین بۆ بابەتی وەرگیراو و ناشاز و نارێك. هۆی ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەسەنایەتی ئەو ئامێرە بلیمەتە، کە هێندە چوست و خێرا دەهێتە سەر زار، کە ناتوانین هێوری بکەینەوە و هێدی هێدی لێی تێ بگەین

١٢ لە ئاستی زمانانی تردا، ئەو ئامێرە بلیمەتە ڕاستەوخۆ دەربازمان دەکات، چونکە ئەو وشە بێگانەیەی کە دەبێت بە کۆسپ لە سەر زمانمان، دەی کات بە جۆرێك لە (ئاوەڵناو) و ئەمجارە وەك کارێکی پسوولەدار سەودای دەکات. بۆ نموونە، لە زانستی کۆمپیوتەردا زاراوەی (کلیك) پەیدابوە. ئەو زاراوەیە بە ڕاستەوخۆیی لە کوردیدا دەبێت (کلیکی دەکەم، کلیك بکە، کلیك کراو، کلیك بوە ، ......). لە گەڵ ئەوەیشدا، وەك هەر کارێکی زمانی کوردی، گشت ئەو نموونانەی پێشەوە لە ژێر سەیوانی چاوگی (کلیك کردن)دا جێیان دەبێتەوە.

١٣ بە پێی خاڵی (١١) و (١٢)، کاری (بوون: کردن) بریتیە لە دەروازە گەورەکەی زمانی کوردی بۆ پێشوازی لە زاراوەی نوێ. واتە، ئەو دەروازەیەی کە زمانەکە دەبەستێتەوە بە زمانی دیکەوە و دەی کات بە زمانێکی زیندوو و چوست و چالاك. خۆزگا هەر هەمووومان لە زرنگی کاری (بوون: کردن) و لە گرنگی ڕێزمانەکەی تێ دەگەیشتین، ئەوسا دەمانتوانی بە پێیەکی دروست و لە بار هەنگاو بکەینەوە بەردو (زمانی کوردی). لە ڕاستیدا، کەرەستەی زمانانی دی، ئەگەر بتوانێت لە چەند شوێنێکدا کەڵکبەخش بێت، بەلام لە ئەو شوێنە گرنگانەدا هیچی پێ ناکرێت و دادەمێنێت لە بەراوەی ڕێزمانی کوردیدا.

### ۷/۲: بەرەنجامی پێشکەوتوو:

بەراستی، ڕێزمانی کوردی فەرزاری کاری (کردن)ە، بە تایبەتی دەرگا واز و والاکانی هەردوو کاری جمکی (ئاوەڵناو + بوون : ئاوەڵناو + کردن) و (بوون بە + ناو : کردن بە + ناو). ئەم دوو کارە، بە جمکی لە دایکبووگن لە پەراسووی کاری (بوونی ئێستاییەوە). پێ دەچێت کە ئەم خێزانەکارە توانیبێتی ڕووداوی کار دابهێنێت، لە ڕووداوی فۆتۆگرافی قەیسەوە بۆ ڕووداوی ڤیدیۆیی جوولەدار و کاتخایەن. ئەمە و دەشێت ئەم گرووپە کارە بە دەمی (دەرخوارد) بناسین، چونکە مزاری (ئاوەڵناو) و (ناو) دەرخواردی ڕێزمانی کوردی دەدەن، لە دەرگای (کار)ەوە، یان کاری تازە دادەهێنن و زمانەکە بە والایی پڕ دەکەن لە کاری نوێ.

### سەرچاوە:


- د. نەسرین فەخری وەستانێك لە ئاستی هەردوو فەرمانی (بوون) و (هەبوون) و (هە) و (هی)دا، گۆڤاری دەستەی کورد، کۆڕی زانیاری عێراق بەرگی ۲۳، ۲٤، بەغدا ۱۹۹۲
- د. شێرکۆ بابان، میکانیزمە بنەڕەتییەکانی ڕستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون هەولێر ۱۹۹۷

مەسعود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد. بەغدا ۱۹۷٦

## بابەتی سێیەم

# ڕێزمانی كاری (كردن) بۆ مۆستایانی زمانی كوردی

### ١/٣: دەستپێك:

لە ڕێزمانی كاردا, كاری (كردن) ڕووبەرێكی زۆر زۆر گەورە و فراوان دەگرێتەوە، لە زۆر جێدا بە چەندین ڕوخسار و بە چەندین بەكارهێنان و بەچەندین واتا دەكەوێتە نێو گوفتارەوە. بە واتایەكی دی, دەیان ڕوخساری لێكدراو و دارێژراوی هەیە و ئەو ڕوخسارانەیش پڕن لە تەمومژ و پڕن لە چەندین گرێكوێرەی ڕێزمانی. بۆ نموونە, چاوگەكانی (نان كردن) و (خانووكردن) لە ڕەسەندا بریتین لە (نان دروست كردن، خانوو دروست كردن). لە ئەو چاوگانەدا, ڕێزمانەكە ڕێی داوە كە وشەی (دروست) بكرتێت. ئەمە و دەیان نموونەی دیكە هەیە و دەیان كێشەی دیكەیش هەیە, بەلاّم هەموو ئەو بابەتانە گەمارۆ نادرێن بە ئاسانی, تا لە نهێنیەكانی كاری (كردن) تێ نەگەین. هەر لە بەر ئەوە, لە كۆپلەكانی داهاتوودا بابەتەكە خاو دەكەینەوە و نەختێك لە ئەو نهێنیانە دەرخەین كە گەمارۆ نادرێن بە ئاسانی, ئەگەر لە نهێنیەكانی كاری (كردن) تێ نەگەین.

### ٢/٣: بنچینە و ڕەسەنی كاری (كردن):

لە سەر ئەندازەی هەردووكاری (كەوتن: خستن)، كاری (كردن) لە ڕەسەندا بریتیە لە (بوونی بوونایەتی) و ئەگەر بەراورد بكرێت بە ئەو نموونەیەی سەرەوە, دەشێت هەردوو كارەكە بەیەكەوە ناو بنێین (بوون: كردن). بە واتایەكی دی, كاری (بوون: بوونی بوونایەتی) بریتیە لە دیوە تێنەپەڕەكەی كاری تێپەڕی (كردن). سەبارەت بە (بوونی بوونایەتی). ئەم كارە بریتیە لە ڕێژەی شەش كەسی ڕێزمانی, لە چەشنی:

**من ئامادە دەبم**

**تۆ ئامادە دەبیت**

**ئەو ئامادە دەبێت**

**ئێمە ئامادە دەبین**

**ئێوەی ئامادە دەبن**

**ئەوان ئامادە دەبن**

بۆ جیاوازی لە نێوان جۆرەكانی (بوون)دا، لە ئێرەدا دەبێت (بوونی ئێستایی) جودا بكەینەوە لە (بوونی بوونایەتی). لە ڕاستیدا. بوونی ئێستایی ئەم شەش ڕێژە دەگرێتەوە:

**من ئامادەم، تۆ ئامادە دەبیت، ئەو ئامادەیە**

**ئێمە ئامادەین، ئێوە ئامادەن، ئەوان ئامادەن**

بێگومان، ئەو دوو جۆرە ڕێژەیەی كاری (بوونی بوونایەتی) و كاری (بوونی ئێستایی) بە چەند پێوەرێك لە یەكدی جودا دەكرێتەوە، وەك:

**یەكەم**: ڕێژەی ڕانەبردووی بوونی بوونایەتی بە پۆلە جێناوی (م. یت. ێت. ین. ن. ن) ڕۆ دەنرێت، بەڵام هی بوونی ئێستایی بە پۆلە جێناوی (م، یت، ە، ین، ن، ن). بە واتایەكی دیكە، مۆرفیمی ئێستایی (ە) لە بوونی بوونایەتیدا دەرناكەوێت و لە جێگەكەی جێناوی كەسی سێیەمی تاك (ێت) دەردەكەوێت.

**دووەم**: ڕێژەكانی بوونی بوونایەتی دەتوانن پاشگری دووپاتی (ەوە) وەربگرن. وەك:

من ئامادە دەبمەوە

تۆ ئامادە دەبیتەوە

ئەو ئامادە دەبێتەوە

کەچی ئەم کردەومیە قەدەغە لە ئاستی ڕێژەکانی (بوونی ئێستایی)دا.

**سێیەم**: ڕێژەکانی کاری (بوونی ئێستایی) بە ئامرازی (نی) دەکرێن بە (نەرێ)، کەچی ئەوانەی (بوونی بوونایەتی) بە ئامرازی (نا) دەکرێن بە نەرێ وەك:

| بوونی ئێستایی | بوونی بوونایەتی |
|---|---|
| من ئامادە نیم | من ئامادە نابم |
| تۆ ئامادە نیت | تۆ ئامادە نابیت |
| ئەو ئامادە نیە | ئەو ئامادە نابیت |
| ئێمە ئامادە نین | ئێمە ئامادە نابین |
| ئێوە ئامادە نین | ئێوە ئامادە نابن |
| ئەوان ئامادە نین | ئەوان ئامادە نابن |

**چوارەم**: بە بەراورد لە گەڵ زمانی عەرەبیدا، ڕێژەکانی (بوونی بوونایەتی) واتای کاری (اصبح) دەبەخشن، کەچی ڕێژەکانی (بوونی ئێستایی) واتای کاری (کان) دەبەخشن.

**پێنجەم**: ڕیژەکانی (بوونی بوونایەتی) ڕووداوێکی ڤیدیۆیی و بزووت پێشان دەدەن. لە بەرانبەردا، ڕێژەکانی (بوونی ئێستایی) تەنیا وێنەیەکی فۆتۆگراڤ نەبزووت پیشان دەدەن. بە واتایەکی دیکە، ڕووداوی ڕێژەکانی (بوونی بوونایەتی) کات خایاندن دەنوێنن، کەچی ڕێژەکانی کاری (بوونی ئێستایی) پەیوەندییان بە کات خایاندنەوە نیە.

## ۳/۳: کاری کردن و کاری بوون بە شیکار:

وەك لە کۆپلەی پێشتردا باسکرا، ڕێژەکانی (بوونی بوونایەتی) بریتین لە دیوە تێنەپەڕەکەی کاری (کردن). یان، بە پێچەوانەوە ڕێژەکانی کاری (کردن) بریتین لە دیوە تێپەڕەکەی کاری (بوونی بوونایەتی). بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە، دەتوانین نموونەکانی (بوونی بوونایەتی) بکەین بە (تێپەڕ) بۆ ئەوەی کاری (کردن) دەربکەوێت. وەك:

| رێژەكانی (بوونی بوونایەتی (تێنەپەڕ) | رێژەكانی كاری (كردن) (تێپەڕ) |
|---|---|
| من ئامادە دەبم | من تۆ ئامادە دەكەم |
| تۆ ئامادە دەبیت | تۆ من ئامادە دەكەیت |
| ئەو ئامادە دەبێت | ئەو تۆ ئامادە دەكات |
| ئێمە ئامادە دەبین | ئێمە تۆ ئامادە دەكەین |
| ئێوە ئامادە دەبن | ئێوە ئێمە ئامادە دەكەن |
| ئەوان ئامادە دەبن | ئەوان ئێوە ئامادە دەكەن |

كەواتە, چاوگی رێژەكانی (بوونی بوونایەتی) بریتیە لە (ئامادەبوون) و لە بەرانبەردا چاوگی رێژەكان كاری (كردن) بریتیە لە (ئامادەكردن). ئێستایش, ئەگەر ئەو دووچاوگە بەرانبەر بە یەكتر بنووسین, وەك (ئامادەبوون: ئامادەكردن). ئەوا ئەو خزمایەتیە دەردەكەوێت و ئەو تەنیا جیاوازییەیش دەردەكەوێت كە بریتیە لە (تێپەڕ و تێنەپەڕ) لە سەر ئەندازەی كاری (كەوتن: خستن) وەك:

| تێنەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|
| ئامادەبوون | ئامادەكردن |
| كەوتن | خستن |

### ٤/٣: دیوێكی تر لە كاری (بوون: كردن):

كاری (بوون: كردن) دەتوانێت ئامرازی (بە) وەربگرێت و ببێت بە (بوون بە... : كردن بە...) وەك:

منداڵەكە (بووبە) بە شاگرد

من منداڵەكەم (كردبە) بە شاگرد

لە ڕێژەکانی کاری (بوون بە...)دا, هەردوو لایەنەکە زۆر بەجوانی ئاشکرا دەبن و گشت نموونەیەکی (بوون بە...), لە هەر جێیەکدا هەبێت دەشێت بکرێن بە (کردن بە...). تەنانەت, چاوگی تێنەپەڕی (کردن بە...) بە جوانی بەرانبەر بە واتای (بوون بە...) دەوەستێت. وەك:

بوون بە سەهۆڵ : کردن بە سەهۆڵ

بوون بە مامۆستا: کردن بە مامۆستا

بوون بە هاوڕێ : کردن بە هاوڕێ

### ٥/٣: ڕێژەی بکەر نادیار:

وەك لە پێشەوە باسکرا, لە هەر جێیەکدا کە ڕێژەکانی (بوونی بوونایەتی) و (بوون بە) هەبێت. دەشێت بکرێن بە کاری (کردن) و (کردن بە...), بەڵام ئەمجارەیان بە (تێپەڕی). بە تەریبی لە گەڵ ئەم میکانیزمەدا, ڕێژە تێپەڕەکانی هەردوو کاری (کردن) و (کردن بە...) میکانیزمی (بکەرنادیاری) پەسەند دەکەن: وەك:

ئامادەبوون: ئامادەکردن: ئامادەکران

یان,

بوون بەشاگرد: کردن بەشاگرد: کران بە شاگرد

بۆ نموونە دەگوترێت:

منداڵەکەم جوان بوە

کێ منداڵەکەی جوان کردوە؟

منداڵەکە جوان کراوە.

یان

منداڵەکە بوو بە شاگرد

کێ منداڵەکەی کرد بە شاگرد؟

منداڵەکە کرا بە شاگرد

بەراوردی نێوان ئەو دوو دەستە ڕستەیە دەری دەخات کە لە ڕستەی دووەمیدا تەنیا هەر ڕێژەکە کراوە بە (تێپەڕ) و لە ڕستەی سێیەمدا تەنیا هەر ڕێژەکە کراوە بە (بکەرنادیار) و لە هەرسێ ڕێژەکەدا واتا و قەوارەی کارەکە پارێزراوە. لە ئەم ئاستەدا, دەتوانین نموونەکە بە هەر کارێکی دی بشوبهێنین وەك:

سووتان: سووتاندن: سوتێنرا

ئامادەبوون: ئامادەکردن: ئامادەگران

بوون بە ئاو: کردن بە ئاو: کران بە ئاو

## ٦/٣: کاری (بوون: کردن) بە بەڵگە:

بێگومان, چەند بەڵگەیەك هەیە بۆ خزمایەتی نێوان کاری (بوون) و کاری (کردن). بە واتایەکی دی, چەند بەڵگەیەك هەیە بۆ ئەوەی بتوانین بڵێین: کاری (بوونی بوونایەتی) بریتیە لە بنچینەی تێنەپەڕی کاری (کردن):

**بەڵگەی یەکەم**: وەك لە پێشەوە باسکرا, لە هەر جێیەکدا کە کاری (بوون), یان (کردن), ئامرازی (بە) هەڵ بگرێت. ئەوا میکانیزمی (بوون: کردن) لە ئارادایە, وەك:

ئازاد (بوو بە) دارتاش: کێ ئازادی (کرد بە) دارتاش؟

هەویرەکە (بوو بە) نان : شیلان هەویرەکەی (کرد بە) نان

کەواتە, هیچ لە مپەڕێك, یان ئاستەنگێك, لە بەردەم ئەم میکانیزمەدا نیە و هەر (بوون)ێك کە ئامرازی (بە) هەڵ بگرێت, دەشێت بکرێت (کردن بە...), یان بە پێچەوانەوە.

**بەڵگەی دووەم**: کاری (بوونی بوونایەتی) پاشگری دووپاتی (ەوە) وەردەگرێت و واتاکەی دەگۆڕێت بۆ (وازکردن: والآکردن) وەك: (بوون + ەوە ← بوونەوە), یان وەك ڕستەی: (دەرگاکە بوەوە). بەرانبەر بە ئەم نموونەیە, ڕێزمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە و

بنچینەی تێنەپەڕی کاری (کردنەوە) دەدۆزێتەوە, وەك:

شیلان دەرگاکەی کردەوە : دەرگاکە بوودوە

کەواتە, وەك چۆن (بوون: کردن) و (بوون بە...: کردن بە...) هەن, هەر ئاوهایش کاری (بوونەوە: کردنەوە) هەیە.

**بەڵگەی سێیەم**: کاری (بوونی بوونایەتی) دەکرێت ڕێزێك لە پێشکاری (واتاگۆڕ) وەربگرێت. وەك: (هەڵ. دا. ڕۆ):

هەڵ بوون: هەڵ کردن

دا بوون: داکردن

ڕۆ بوون: ڕۆ کردن

بە یەکسانی لە وەرگرتنی ئەم پێشگرانەدا, زۆر بە ئاسانی دەتوانین بی سەلمێنین کە کاری (کردن) بریتیە لە دیوە تێپەڕەکەی کاری (بوونی بوونایەتی).

## ٧/٣: بۆ مامۆستایانی زمانی کوردی:

ئەی مامۆستایانی بەڕێز, ئێوە دەزانن کە کاری (کردن) چەند چالاکە و چەندیش ئاڵۆزە لە ڕێزماندا. لە ئەوانەیشە ڕۆژانە چەندین پرسیارتان لە لایەن قوتابیە ئازیزەکانەوە ئاراستە بکرێت و لە ئەو پرسیارانەدا ئەم کارە بریتی بێت لە تەوەری کێشەکان. لە زمانەکەی ئێمەدا, کاری (کردن) هێندە گرنگە, ڕەنگە هیچ کارێکی دیکە ئەو ئاکارەی نەبێت. تەنانەت, لە هەر تێکستێکدا و لە هەر چامەیەکدا, یان لە هەر گفتوگۆیەکدا, دەیان جار دەهێتە بەرگوێ و لە هەر جێیەکیشدا تایبەتمەندی خۆی هەیە. بێگومان, لە ڕێزمانی کوردیدا, چی لە زانکۆکان و چی لە قوتابخانەکاندا, هەندێك کێشە بە بڕشتی (زمانی ژێری) لێك دەدرێنەوە, نەك بە (ڕێزمان). لە ئەم ڕووەوە, ئێمە

هەرهەموومان ڕۆژانە ئەم کارە گرنگە بە زەبری (زمانی ژیری) بەکاردەهێنین. دەبا ئیدی ڕوو لە ڕێزمانە نازدارەکەی بکەین، ئەو ڕێزمانەی کە دەتوانێت خزمەتێکی گەورە پێشکەش بکات بەسەرتاسەری ڕێزمانی کوردی. هەر لە بەر ئەوە، لە خاڵەکانی داهاتوودا پوختەیەك دەخەینەڕوو، بە ئەو هیوایەی کە مامۆستایانی ئازیز کەڵکی لێ وەربگرن:

### ٧/٣: بەرەنجام و پوختەکاری:

- بنچینەی کاری (کردن) بریتیە لە (بوونی بوونایەتی). یان، کاری (کردن) واتای دیوە تێپەڕەکەی کاری (بوونی بوونایەتی) هەڵ دەگرێت. یان، کاری (بوونی بوونایەتی) بریتیە لە دیوی (تێنەپەڕ) بۆ کاری تێپەڕ (کردن).
- وەك کاری (بوونی بوونایەتی) داڕشتەیەکی هەیە لە چەشنی (بوون بە...) بەهەمان شێوە کاری (کردن) داڕشتەیەکی هەیە لە بەرانبەری، وەك (کردن بە...).
- سەرەتای گوتنەوەی بابەتی کاری (کردن) دەبێت بە میکانیزمی (بوون: کردن) دەست پێ بکات. پاشان دەست بکەین بە گوتنەوەی (بوون بە...: کردن بە...).
- کاری (بوونەوە: کردنەوە) جوانترین بەڵگە بۆ ئەوەی لە ئەو خزمایەتیە تێ بگەین کە لە نێوان کاری (بوون) و کاری (کردن)دا هەیە.
- لە ئەو میکانیزمانەدا کە سەرەوە باسکران، هەردوو تاکەکەی جووتکارەکانی (بوون: کردن) و (بوون بە... کردن بە) و (بوونەوە: کردنەوە) بە تەواوی یەکسانن بە (واتا)، بەڵام جیاوازی ئەوەیە کە تاکی یەکەم (بوون: بوون بە: بوونەوە) تێنەپەڕە و تاکی دوەم (کردن: کردن بە: کردنەوە) تێپەڕە.
- ڕەنگە بتوانین کاری (کردن) بە گرنگترین و بە بەرفراوانترین کاری زمانی کوردی بناسین. لە ئەم بانێژەیەوە، ئەم ئیشەی بەردەست دەتوانێت زۆر دەرگای کۆلۆمدراو و زۆر کونجی تاریك ئاشکرا بکات.
- دەروازەی ڕێزمانی (بوون: کردن) بریتیە لە ئەو کەناڵەی کە (زمانی کوردی)

دەبەستێت بە زمانانی دیکەوە. بۆ نموونە, لە گەڵ تەکنیکی کۆمپیوتەردا, ئەگەر کارێك پەیدا بووبێت بە زمانی ئینگلیزی, وەك (to save) یەکسەر و بەبێ بیرکردنەوە, میکانیزمی (بوون: کردن) کوردانەوویەتی وەك:

نامەکە سەیف بوە : نامەکەم سەیف کردوە

چۆن سەیف بوو؟ چۆن سەیڤت کرد؟

چۆن سەیف دەبێت؟ چۆن سەیف نەکراوە؟

- ئەو کارانەی کە لە خاڵەکانی پێشەوەدا باسکران, دەشێت ڕێژەی (بکەرنادیار)یان هەبێت, وەك:

| تێنەپەڕ | تێپەڕ | بکەر نادیار |
| --- | --- | --- |
| بوون | کردن | کران |
| بوونە بە... | کردن بە... | کران بە... |
| بوونەوە | کردنەوە | کرانەوە |

- لە پەراوێزی ئەم نووسینەدا, هەندێك نموونەی (کوێرەك) هەیە, وەك (بەربوون: بەردان) یان هەندێك نموونە کاری (بوون) پەسەند ناکەن, وەك (ڕاکردن، داواکردن، نان کردن.... هتد). ئەم جۆرە نموونانە هەر یەکە و شلۆقە و شیکاری تایبەتی خۆی هەیە, کە لە ئێرەدا پێویست ناکات زۆر لە سەری بڕۆین.

**سەرچاوە:**

- هەندێك لە نووسین و بلاوکراوەکانی خۆمان.
- کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی، ١٩٩٩.
- د. نەسرین فەخری, وەستانێك لە ئاستی هەردوو فەرمانی (بوون و هەبوون) و (ە) و (هی)دا, گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق (دەستەی کورد), بەرگی (٢٣ـ٢٤), بەغدا ١٩٩٢.

## بابەتی چوارەم

# گەشتێك بەنێو ڕێزمانی کاری (دان)دا

### ٤/١: دەستپێك:

لە زمانی کوردیدا، ڕێزمانی کار زۆر سەخت و خەستە. لە ئەم ڕوانگەیەوە، کاری (دان)یش بریتیە لە یەکێك لە ئەو گلێنە ڕێزمانیە ئاڵۆزانەی کە بە ئاسانی ڕوون نابێتەوە و ڕەنگە ڕێزمانی تۆمارکراویش نەتوانێت دادی بدات. بەداخەوە، ئەو ڕێزمانەی کە ئێستا هەیە و دەگوترێتەوە, بریتیە لە توێژاڵێکی زۆر تەنك و بچڕبچڕ لە ئەو ڕێزمانە ئەستوور و دژوارەی کە لە بیری هەر هەمووومان هەیە و زمانی هەر هەمووومانی پێ دەکەوێتە گەڕ. سەبارەت بە ڕێزمانی کاری (دان)، ئەم کارە گرنگە ڕێزمانەکەی وردە و پڕە لە پێچی ڕێزمانی و پڕە لە گێژەنی واتاسازی. لە ئەم نووسینەدا، دەمانەوێت، بە وردی ڕێزمانی کاری (دان) لێك بدەینەوە، تا ئەو ڕادەیەی کە نهێنیەکانی دەکەونە سەر ئاوی توێژینەوە. بە هیواین. خوێنەری ئازیز تێ بگەیەنین و وای لێ بکەین کە بتوانێت بابەتەکە بەراورد بکات لە گەڵ ئەو ڕێزمانەی کە ئێستا دەگوترێتەوە.

### ٤/٢: سەرەتایەك لە سەر کاری (دان):

کاری (دان) بریتیە لە کارێکی (تێپەڕ) و لە ڕستەدا بەرکارێك داگیر دەکات، وەك:

**من (پارە) دەدەم : من (پارە)م دا**

لە دیوی (بكەر نادیار)دا، ئەم كارە دەبێت بە (دران) و دەشێت بگوترێت:

**(پارە) دەدرێت : (پارە) درا**

ئەم رستانەی دوایی بكەری (من) لا دەبەن و بەركاری (پارە) دەكەن بە (جێگری بكەر).

### ٣/٤: كاری (دان) بە رووتی:

وەك لە كۆپلەی پێشوودا باسكرا، كاری (دان) بریتیە لە كارێكی (تێپەڕ) و بەركار داوا دەكات. لە ئەم هەلۆێستەدا، ئەگەر رستەكە رووت بكەینەوە لە (بەركار)ەكە، ئەوا واتای كارەكە دەبەسترێت بە (بەركار)ێكی نادیارەوە و ئەو جۆرە (بەركار)ەیش دەكەوێتە بەر واتایەكی گەمار (تابۆ). واتە، ئەو وشانەی كە ناشیرینە لە گوفتاردا گۆ بكرێت. تەنانەت، گۆ كردنی چاوگی (دان) بەبی (بەركار) لە ئەم نموونانەدا:

**(پارە)دان، (هان)دان، (سەر)دان، (كوڵ)دان، .... هتد**

دەبێت بە هۆی چەواشە بوونی واتاكەی بەرەو واتایەكی (تابۆ) و ناشیرین. ئەم جۆرە واتایەیش هەل و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە و بە ئەم چەشنە پەیدا دەبێت:

**یەكەم**: ئەگەر (بەركار)ێكی بەرجەستە لە ریزی رستەكەدا نەبێت.

**دوەم**: ئەگەر كاری (دان) پاشگری دووپاتی (ەوە)ی پێوە نەبێت. بۆ نموونە، كاری (دانەوە) واتاكەی چەواشە نابێت بە دیوی (تابۆ)دا، هەرچەندە (بەركار)ی پێوە نەبێت.

سێیەم: ئەگەر كاری (دان) هیچ پێشگرێكی واتاگۆڕی پێوە نەبێت. بۆ نموونە, كارەكانی (هەڵدان، دادان، ڕادان، لێدان، تێدان, ...) واتاكەیان چەواشە نەبوە بە دیوی واتایەكی

لە ئەوەدایە. كە لە تەرازووی واتاسازیدا، كاری (دان لە ...) واتای گۆڕاوە، بەڵام كاری (دان بە...) بەرز نەبومتەوە، تا سەنگی تازەی هەبێت لە تەرازووی واتاسازیدا. بەواتایەكی تر، كاری (دان بە...) هەر لە باری رستەسازی ئاساییدایە.

**٤/٥: كاری (دان) بە یاریدەدەری:**

كاری (دان) بۆ هەیە لە دیوی یاریدەدەردا، بەركارێكی نابەرجەستە وەربگرێت و لە گەڵیدا، واتایەكی (لێكدراو) چێ بكات، وەك:

**(وچان)دان، (پشوو)دان، (نزرگەرە)دان، (هەنیسك)دان، (بانگ)دان، (هەواڵ)دان، (هەوڵ)دان، (باوێشك)دان، (كول)دان، (كۆڵ)دان، (نووچ)دان...**

لەئەم بارە یاریدەدەرەدا، كاری (دان) بۆی هەیە كە خانەی (بەركار) پڕ بكاتەوە بۆ هەر ناوێكی واتایی و (بەجێ) بۆ چێ كردنی واتایەكی تازە بەلێكدان، وەك:

| خانەی بەركار (+ ٥) | خانەی كار (سفر) |
|---|---|
| وچان | |
| پشوو | |
| نزگەرە | دان |
| بانگ | |

بێگومان، دەرگای ئەم ڕێسایە کراوەیە و دەشێت دەیان و سەدان وشەی (بەجێ) بدۆزینەوە و بی کەین بە (بەرکار) لە گەڵ کاری (دان)ی یاریدەدەردا. هەر لە بەر ئەم هۆیەو هەر لە بەر ئەم (ڕێسا) ڕوون و ڕەوانە، دەشێت لیستێك بکەین بۆ ئەو کارانەی کە بەئەم میکانیزمە دەبن بە (کاری لێکدراو). لە گەڵ گشت ئەوەدا، چەند ئاکارێك هەیە لە ئەم جۆرە کارە لێکدراوەدا، وەك:

**یەکەم**: ئەو وشەیەی کە دەچێتە نێوخانەی بەرکار دەبێت نابەرجەستە، یان واتایی بێت.

**دووەم**: هێزی تێپەڕی کارە لێکدراوەکە دەگۆڕێت بۆ (تێنەپەڕی واتایی)، چونکە بەرکارە ڕاستەوخۆکە ئەرکی واتاگۆڕکێ دەگێڕێت.

**سێیەم**: ئەو وشەیەی کە دەبێت بە کەرتی بەرایی و لە جێی (بەرکار) دادەنیشێت هیچ دەستکارییەکی ڕێزمانی، یان لابردن، پەسەند ناکات، چونکە تەوەری واتا تازەکەی لە سەر دەگەڕێت و ناشێت و نابێت لە ڕیزەکەدا وندا ببێت.

لەنموونەیەکی تردا، لە سەر کێشی نموونەکەی پێشەوە. ئەگەر گوترا: (**شیلان پشوو دەدات**)، ئەوا بەرکاری (پشوو)، ئەدگاری (واتایی) دەنوێنێت، نەك ئەدگاری (بەرجەستەیی). هەر لە بەر ئەو هۆیە، ئەگەر بەرکاری (پارە) بگۆڕێت بە بەرکاری (پشوو)، ئەوا یەکێك لە ڕەگەزە واتاییەکانی کاری (دان) لە ناو دەچێت و ئەدگاری کاری (یاریدەدەر) زاڵ دەبێت بەسەرکاری (دان). بەواتایەکی تر، سەمتی کاری (دان)ی ئاسایی دەگۆڕێت بە سەمتی (کاری یاریدەدەر). لە ئەم ڕوانگەیەوە، سەمتی کاری (دان)ی یاریدەدەر دەکەوێتە کار بە ڕووی هەر بەرکارێکی (نابەرجەستە)دا و لە ئاستی هەر بەرکارێکی (بەجێ)دا کارێکی لێکدراو فڕێ دەداتە نێو فەرهەنگی زمانی کوردیەوە.

### ٥/٥: کاری (دان) بە رووتی:

کاتێك کاری (دان) بەبێ (ئامراز) و بەبێ (بەرکار) لە رستەدا بەکار دەهێنرێت، یان بەشێوەی (چاوگ) دەخرێتەڕوو، واتایەکی (تابۆ) هەڵ دەگرێت. هۆی ئەو دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی کە هەردوو کاری (دان) و (کردن) لە گەڵ (کەرت)ێکی تابۆدا، یەك دەگرن و دوو کاری لێکدراو پێك دەهێنن. لە باری تابۆدا، رێزمانی کوردی رێ دەدات کە ئەو کەرتە تابۆیە گۆنەکرێت. هەر لە بەر ئەوە، هەرکاتێك کە کاری (دان) یان (کردن) بە رووتی بەکاربهێنرێت، ئەو واتا تابۆیە خۆی زاڵ دەکات بەسەر بیردا. هەر بۆ پرۆڤە، ئەگەر هەر پاشگر و پێشگرێك بخەینەسەر کاری (دان)، ئەوا لە واتای (تابۆ)ی پاك دەبێتەوە، وەك (هەڵدان، رادان، دادان، پێ دان، لێدان، دانەوە، هاندان، بانگدان).

### ٦/٥: کاری (دان) و پاشگری دووپاتی (ەوە):

وەك پاشگری دووپاتی (ەوە) گشتیە بۆ گشت کاری زمانەکەمان، دەچێتەسەر کاری (دان)یش و دەی کات بە (دانەوە) بە دوو واتای جیاوازەوە، وەك:

**شیلان جارێکی تر پارەکە دەداتەوە بە ئازاد**

واتە، جارێك پارەی داوە و بۆ دوەم جاریش هەر ئەو (پارەکە) دەداتەوە بە ئازاد، وەك:



**- واتای دوەم:**

**ئازاد پارەكە دەداتەوە بە شیلان**

واتە، شیلان پارەكە (بەركار)ی داوە بە (ئازاد) و لە پاشتردا (ئازاد) بوە بە (بكەر) و پارەكەی داوەتەوە بە (شیلان). كەواتە، ئەركی رستەسازیانەیان گۆڕیوەتەوەو میكانیزمەكەیان گۆڕیوە، وەك:




لەرێزمانی كوردیدا، دەشێت كۆلكەی پارەدەرەكە (شیلان) لاببەین. یان هەردوو كۆلكەی (پارەدەر) و (پارە وەرگرەوە)، كە بریتین لە (شیلان)، لاببەین، وەك:




لەئەم ئاستەدا، چاوگێكی فالاّ پەیدا دەبێت لە چەشنی (...دانەوە)، یان بەتەرخان كراوی دەبێت بە (پارە دانەوە). بێگومان، ئەم چاوگە تازەیە دەكەوێتە بەر بلاّوبوونەوەو دەبێت بەكارێكی (پاریدەدەر) لە گەلّ ئەو (بەركار)ەدا كە هەلّی دەگرێت و لە هەر

جوولەیەکی سنتاکسیدا، واتایەکی تازەتر دادەهێنێت، وەك:

| (...) دان | (...) دانەوە |
|---|---|
| (دەنگ) دان | (دەنگ) دانەوە |

یان لە گەڵ پێشگری (واتاگۆڕ) یەك دەگرێت و واتای تازە دادەهێنێت.

| (...) دان | (...) دانەوە |
|---|---|
| (بەر) دان | (بەر) دانەوە |
| (هەڵ) دان | (هەڵ) دانەوە |
| (دا) دان | (دا) دانەوە |

لە ئاستی ئەم جۆرە نموونەدا، چەند سەرنجێك هەیەو دەشێت تۆمار بکرێن، وەك:

**یەکەم**: لە نموونەکانی دەستە ڕاستدا، کاری (دان) کەوتوەتەبەر واتاگۆڕکێ، بەلام لە نموونەکانی دەستە چەپدا کاری (دان + ەوە) کەوتوەتەبەر واتاگۆڕکێ.

**دوەم**: بە هۆی پاشگری دووپاتی (ەوە), واتای نموونەکانی دەستە چەپ بە تەواوی جیاوازە لە هی نموونەکانی دەستە ڕاست. هەر بۆ پرۆڤە، واتای (دەنگ دان) لە کوێ و واتای (دەنگ دانەوە) لە کوێ؟ یان واتای (بەربوون) و واتای (بەربوونەوە) لە کوێ؟ یان، کاری (دان) لە

بەرەیەكدا كاردەكات كە جیاوازە لە بەرەكەی كاری (دانەوە).

**سێیەم**: وەك حەشارگەیەكی زمانی كوردی، لە ئەو نموونانەی سەرەوەدا، هەر نموونەیەك دووجار كەوتوەتە بەر بزافی (واتاگۆڕكێ)، هەر بۆ پراوە، ئەگەر یەكێك لە چاوگەكانی دەستە چەپ وەربگرین وەك (هەڵ دانەوە)، جارێك (جاری یەكەم) پاشگری دووپاتی (ەوە) واتای كاری (دان)ی گۆڕیوەو كردوویەتی بە (دانەوە)و جارێكی تر پێشگری واتاگۆڕ (هەڵ) واتای كاری (دانەوە)ی گۆڕیوە بۆ (هەڵدانەوە).

**چوارەم**: لە پەراوێزی خاڵی پێشوودا، زۆر گران و دژوارە كە بزانرێت، كام میكانیزم یەكەم جار چەسپاوە. واتە، یەكەم جار پێشگری (هەڵ) چەسپاوە و كاری (هەڵدان)ی داهێناوە و لە پاشتردا پاشگری (ەوە) واتای كاری (هەڵ دان)ی گۆڕیوە بۆ (هەڵدانەوە). یان بەپێچەوانەوە، پاشگری (ەوە) واتای كاری (دان) گۆڕیوە بۆ كاری (دانەوە) و لە پاشتردا پاشگری (هەڵ) چەسپاوە و كاری (دانەوە)ی كردوە بە (هەڵ دانەوە). لە لایەنی ئێمەوە، ئێمە باری (دوەم) بەسەرمەشقتر دەزانین, وەك:

**یەكەم هەنگاو**:

كاری (دان) + پاشگری (ەوە) ← كاری (دانەوە)

**دوەم هەنگاو**:

پێشگری (هەڵ) + كاری (دانەوە) ← كاری (هەڵ دانەوە)

بە واتایەكی تر، هەردوو كاری (دان) و (دانەوە) بەتەریبی ڕوودەكەن لە (واتاگۆڕكێ)، بەڵام بە یەكسانی نا، چونكە مەرج نیە كە هەردووكیان بتوانن هەمان كۆڵكەی (واتاگۆڕ) وەربگرن بە تەریبی.

**پێنجەم**: کاری (دانەوە) ئەگەر بەرووتی بەکارهێنرا وەك: **(ئـازاد دەی داتـەوە)**, واتـای (چەژنتی ئەنجامی کردەوەیەکی نادروست) دەبەخشێت، واتـە، وەك چۆن (ئـازاد) ئـەو ستەمەی کردوە دەبێت ئەنجامە تاڵەکەی بچێژێت.

**٧/٥: پلەکانی ئاڵۆزی لە واتای کاری (دان)دا:**

لە کۆپلەی پێشوودا، ریزێك نموونە خرانەروو و لە ئەو نموونانـەدا، بـاری ئـاڵۆزی دەرخرا، بەڵام بابەتەکە هێشتا بە باشی پەرەوازە نەبوە، وەك:

**ئاستی یەکەم**: لە ئەم ئاستەدا، کاری (دان) پاشگری دووپاتی وەردەگرێت، وەك:

**(دان + ەوە : دانەوە)**.

**ئاستی دوەم**: لـە پـاش ئاسـتی یەکـەم, کـاری (دان) دەکەوێتـە کـار و بـەرکارێکی بـەجێ وەردەگرێت و دەرگا دەکاتـەوە بـۆ (ڕێزمـانی کـاری لێکـدراو)، وەك: **(دەنگـدان، (وچانـدان، (هەناسەدان، (بانگدان، ...)**.

**ئاستی سێیەم**: مەرج نیە کاری (دان) هەر (بەرکار) وەربگرێت دەتوانێت پێشگری واتاگۆڕ جێ بکاتەوە، وەك: **(هەڵدان، ڕادان، دادان، بەردان، دەردان، وەردان، ...)**.

**ئاستی چوارەم**: جاری وا هەیە کە بە پێشگری ناوی واتای کاری (دان) دەگۆڕێت، وەك: **(تاودان، جاردان، هاندان، گاڵدان، دنەدان، بادان، ...)**.

**ئاستی پێنجەم**: هەندێك جار بە تەریبی لە گەڵ ئاستی دوەمدا، پاشگری دووپاتی لە ڕێگای کاری (دانەوە)وە جارێکی تر واتا دەگۆڕێت، وەك: **(دەنگ دان : دەنگ دانەوە)**.

**ئاستی شەشەم**: بەرانبەر بە ئاستی سێیەم، هەندێك جار، واتای کاری (دان) جارێکی تر دەگۆڕێت، وەك:

**هەڵ دان ← هەڵ دانەوە**

**بەردان ← بەردانەوە**

**ئاستی هەفتەم**: بەرانبەر بە ئاستی چوارەم، هەندێك جار میکانیزمی واتاگۆڕکێ دووبارە دەبێتەوە، وەك: **(بادان ← بادانەوە)**.

**ئاستی هەشتەم**: لە هەندێك لە ئەو واتا تازانەدا، میکانیزمی (فرەواتایی) دەچەسپێت و لە وانەیە نموونەیەك چەند واتایەك بداتەوە، وەك کاری (دادان)، وەك:

**- دادان : تیژکردنی پێنووس و چشتی تر**

**- دادان : دابەستنی سەرمتای (نوێژ)**

**- دادان : دەلاندنی ئاو لە چشتی فشەڵەوە**

**ئاستی نۆیەم**: هەردوو کاری (دان) و (دانەوە) بەیەکسانی ناکەونەبەر میکانیزمی واتاگۆڕکێ. بۆ نموونە، (دەنگ دان و دەنگ دانەوە) دوو واتای جیاوازن، بەلاّم (وچان دان و وچان دانەوە) ئەو مەرجەیان تێدا نیە. یان، کاری (ڕەنگ دانەوە) هەیە، بەلاّم کاری (ڕەنگ دان) بێ واتایە. بەهەمان شێواز، هەردوو کاری (بادان و بادانەوە) لە یەکتری جودابوونەتەوە بە (واتا)، بەلاّم (تاودان و تاودانەوە) ئەو مەرجەیان تێدا نیە. کەواتە مەرجی چێ بوونی (کاری لێکدراو) بە (بژار)ە، نەك بە گشتی و لە ئەو کارە لێکدراوەدا، مەرجی (واتاگۆڕین) بریتیە لە بەردی بناغە.

## ٨/٥: کاری (دان) وەك کارێکی ناسادە:

لە ڕێزمانی کوردیدا، کاری ناسادە پۆلێنکراوە بۆ (کاری داڕێژراو) و (کاری لێکدراو). لە ئەم ڕووەوە، کاری (دان) دابەشبوونێکی جوانی تێدا هەیە، بۆ پۆلێن کردنێکی هوردتر و کاریگەرتر. بۆ نموونە، لە ئەو ئیشانەدا کە ئێمە ئەنجامماندا داوە، سێ خانە دیاریکراوە بۆ داهێنانی کاری ناسادە، وەك: (بڕوانە بۆ کتێبی ڕێزمانی کاری ناسادە/ هەولێر ٢٠١٤).

<u>یەکەم</u>: خانەی (+ ٢)، واتە ئەو خانەیەی کە پێشگری واتاگۆڕ هەڵ دەگرێت، وەك: پێشگری (هەڵ، دا، ڕا، ڕۆ) بۆ داهێنانی واتای داڕێژراو لە چەندین (کاری داڕێژراو)دا. یان، پێشگری ئاوەڵکاری (بەر، دەر، وەر، لا، پێش، پاش، ژێر، دوا) بۆ چێکردنی (کاری داڕێژراو). پێشگری ناوی وەك (فڕێدان، هاندان، گاڵدان،...) بۆ چێکردنی (کاری لێکدراو).

<u>دووەم</u>: خانەی (+٤)، واتە خانەی ئامرازی پەیوەندی، کە دەشێت دووجۆر چالاکی بنوێنێت، وەك: ئامرازی پەیوەندی بە ڕووتی و بەبێ تەواوکەر بۆ چێکردنی (کاری داڕێژراو) لە چەشنی (لێدان، پێوەدان). یان، ئامرازی پەیوەندی بارگەدار بۆ چێکردنی واتایەکی تازە لە (کاری لێکدراو)، وەك (بەفیڕودان) لە دەست دان، لە دڵدان،...).

سێیەم: خانەی بەرکاری ڕستەسازیانە لە خانەی (+٥)دا بۆ چێکردنی (کاری لێکدراو)، وەك (هەناسەدان، وچان دان، پشوودان،...).

ئەو دابەش کردنەی کە لە سەر نموونە ناسادەکانی کاری (دان)دا خرایەڕوو کەڵکێکی زۆر جوان و کاریگەر دەبەخشێت بۆ دابەشکردنی (کاری داڕێژراو) و (کاری لێکدراو) بۆ سێ لق لە هەر جۆرێکدا. لە لایەکی ترەوە، بڕشتی خانەکانی (+٢، +٤، +٥) دەرخرا، چونکە بارگەی ئەو خانانە کە بریتین لە (پێشگر، ئامرازی پەیوەندی بەرکار) دەبن بە (کەرتی بەرایی) لە کاری ناسادە. لە ئیشەکانی ئێمەدا ئەو خانانە ژمارە

ڕێژکراون و ئەو کەسەی مەبەستی بێت کە بەشێوەیەکی هوردتر لە پلیکانەی ئەو خانانە تێ بگات، دەتوانێت ئیشەکانی ئێمە بخوێنێتەوە. لە کۆتایی ئەم بەشەدا، دەتوانین نەخشەیەك بخەینەروو و دابەشبوونێکی ڕوونتر و رەوانتر پێشکەش بکەین بە ڕێزمانی کاری داڕێژراو و کاری لێکدراو، بەلاّم لە روانگەی کاری (دان)ەوە. نەخشەی (١/٥).




نەخشەی (١/٥): نەخشەی دابەشبوونی کاری ناسادە

### ٩/٥: پوختەکاری:

- کاری (دان) ئەگەر بە رووتی بەکارهێنرا، ئەوا واتایەکی تابۆ هەڵ دەگرێت. لە ئەم واتایەدا، کارێکی لێکدراو چێ دەبێت و کەرتی بەرایی لە ئەم کارە دەبێت بە (واتاگۆڕ). لە بەر باری (تابۆیی)، دەشێت کەرتی بەرایی گۆنەکرێت و کەرتی دوای (کاری دان) بە رووتی بمێنێتەوە.

- کاری (دان)، بە ڕووتی، بۆی هەیە پاشگری دووپاتی (ەوە) وەربگرێت و ببێت بەکاری (دانەوە)، واتای ئەم کارە تازەیە خوار دەبێتەوە بەرەو (چێژتنی ئەنجامی کردەوەی خراپ).
- کاری (دان) وەك کارێکی تێپەڕە، بۆی هەیە (بەرکاری ڕاستەوخۆ) وەربگرێت. لە ئاستی ئەو بەرکارەدا، دیاردەیەك دەردەکەوێت، وەك:

**یەکەم**: لە ئاستی (بەرکار)ی بەرجەستەدا، کاری (دان) بە پتەوی و بە ڕەسەنی دەمێنێتەوە.

**دووەم**: لە ئاستی (بەرکار)ی واتاییدا، کاری (دان) بۆی هەیە شل ببێتەوە و دابشلێت بەرەو ڕۆڵی (کاری یاریدەدەر)، وەك (هەناسەدان).

- وەك حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، جۆری (بەرکاری ڕاستەوخۆ) بە (بەرجەستەیی) و بە (نابەرجەستەیی) دەبێت بەهۆی واتای (لێکدراو) لە کاری (لێکدراو)دا. لە ئەم ڕووەوە، هەر بەرکارێکی نابەرجەستە، وەك: (هەناسە، وچان، هەنیسك،...) دەبێت بەهۆی وەرچەرخانی کاری (دان) بەرەو کاری یاریدەدەر.
- هەردوو کاری (دان) و (دانەوە) بۆیان هەیە کاری لێکدراو دابهێنن و لە بوارێکی بەرتەسکدا بۆیان هەیە هەمان کەرتی بەرایی وەربگرن، وەك (دەنگ دان و دەنگ دانەوە).
- هەردوو کاری (دان) و (دانەوە) بۆیان هەیە کاری دارێژراو چێ بکەن و لە هەندێك نموونەدا هەمان کەرتی بەرایی بگوزەرێنن، وەك (هەڵ دان و هەڵ دانەوە).
- هەردووکاری (دان) و (دانەوە) بۆیان هەیە پێشگری ناوی وەربگرن و لە هەندێك نموونەدا هەمان کەرتی بەرایی وەربگرن، وەك: (بادان و بادانەوە).

- وەك لـە خاڵـەکانی پێشـتردا باسـکرا، دەشـێت دووجـار کـاری (دان) بکەوێتەبـەر چالاکی (واتاگۆڕکێ)، جارێك بە پێشگرێك و جارێك بە پاشگری دووپـاتی (ەوە)، لـە هـەمان نموونـەدا، وەك (هـەڵ + دان + ەوە)، (دەنـگ + دان + ەوە)، (بـا + دان + ەوە).
- کاری (دانەوە) بۆی هەیە ببێت بە (رەنگ دانـەوە)، کەچـی کـاری (دان) بـۆی نیـە ببێـت بـە (رەنـگ دان)، چـونکە هـەردوو کارەکـە (دان) و (دانـەوە) دوو بنکـەی واتایی جیاوازیـان هەیـە. لـە ئـەم روانگەیـەوە، نموونـە زۆرن کـە لـە سـەر بنکـەی کـاری (دانـەوە) داهێنـراون، نـەك لـە سـەر بنکـەی کـاری (دان)، وەك: (کاردانـەوە، واتادانەوە، وەڵام دانەوە،...).
- بـەپێی نـاوەڕۆکی خـاڵی پێشـوو، لـە نموونـەی (رەنـگ دان و دەنـگ دانـەوە)دا، هەردوو کاری (دان) و (دانەوە) بەتەریبی روویان کردوە لە وشەی (دەنـگ)، نـەك بە (یەك لە دوای یەك)، چونکە بنکەی جیاواز پێك دەهێـنن بـۆ دروسـت کردنـی (کاری لێکدراو). بە ئەم پاساوە، دەتوانین بڵێین پاشگری (ەوە) واتاگۆڕێکی کۆنـترە لە ئەو واتاگۆڕانەی کە دەکەونە پێش کاری (دان).
- هەردوو کاری (دان بە...) و (دان لە ...) بۆیان هەیە کۆلکەی (بەرکار) بگوزەرێنن لە رێزمانی کاری لێکدراودا، وەك:

**پەرە (بە...)دان : پەرە پێ دان**

**توانج (لە...) دان : توانج لێ دان**

- پێ دەچێت كە دوو خوێندنەوەی رێزمانی هەبێت بۆ (كاری لێكدراو), وەك خوێندنەوەی رستەسازیانەو خوێندنەوەی واتاسازیانە. وەك لە سەر نموونەی (شیلان هەناسە دەدات بە نەخۆشەكە):

یەكەم: خوێندنەوەی رستەسازیانە:

شیلان : بكەر
هەناسە : بەركار — تێپەڕ
دەدات : كار
به ئامرازی پەیوەندی
نەخۆشەكە : بەركاری ناراستەوخۆ

تێپەڕ + بەركاری ناراستەوخۆ

دووەم: خوێندنەوەی واتاسازیانە:

شیلان : بكەر
هەناسە دەدات — كاری لێكدراو — تێنەپەڕی واتایی
بە : ئامرازی پەیوەندی
نەخۆشەكە : بەركاری راستەوخۆ

تێپەڕی واتایی

بێگومان، ئەم جۆرە خوێندنەوەیە ئەو کارانە دەگرێتەوە کە بەکۆلکەی (بەرکار)ی ڕستەسازیانە واتای لێکدراو چێ دەکەن و کاری لێکدراو پێك دەهێنن.

- کاری (دان)، لە پاش ئەوەی واتاکەی دەگۆڕێت. بۆی هەیە جارێکی تر بکەوێتەبەر میکانیزمەکانی (واتادانەوە)، وەك (هەڵ دان : فڕێ دان بەرەو بەرزی)، یان (هەڵ دان : هەڵ کێشانی کەسێك بەرەو بەرزی، بەڵام بە درۆ، یان فشکردنەوەی کەسێکی ناشایستە).

**سەرچاوە:**


- د. شێرکۆ بابان، گەشتێك بەنێو ڕێزمانی کاری (دان)دا، گۆڤاری ئەکادیمی، ژمارە (٤)، هەولێر ٢٠٠٦.
- محەمەد مەعرووف فەتتاح، کار پۆلێن کردن بەپێی ڕۆنان، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٣٩)، بەغدا، ١٩٨٩.
- مەحموود فەتحوڵلا، نامەی ماستەر، کار تەواوکردن لە کوردیدا، زانکۆی سەلاحەدین.
- مەزن عوسمان، هەندێك لە بەراورد و لە سەرنجی زمانەوانی، هەولێر، ٢٠٠٨.
- بەکر عومەر عەلی، کاری لێکدراو و چەند سەرنجێك، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی بۆ زانستە مرۆڤایەتیەکان، ژمارە (٤)، سلێمانی ١٩٩٩.
- د. یوسف شەریف، کاری لێکدراو لە کوردی و فارسیدا، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٩٨.
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، کردار، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٠.

## بابەتی شەشەم

# سێتی ڕێزمانی وەك كەرەستەیەك بۆ فێركردن لە وانەی ڕێزماندا

**١/٦: دەستپێك:**

لە زمانی كوردیدا, زاراوەی (سێت) بەرانبەر بە (دەستە، تاقم، پێڕ) دەوەستێت واتای ئەوە دەبەخشێت، كە هەندێك پارچە و پارچۆلكە دەبن بە (ئەندام) لە نێو تاقمێكدا و ئەو تاقمەیش سیمای (یەكتری تەواو كردن) بە میچەكانی, یان بە پارچەكانی, دەبەخشێت، لە ڕاستیدا, وشەی (سێت) وەك چۆن لە زمانی ترەوە وەرگیراوە، هەر ئاوهایش لە زمانی كوردیدا برەوی پەیدا كردوە. ئەگەرنا, لەزمانەكەدا چەندین وشە هەیە كە بتوانێت جێگای بگرێتەوە وەك (دەستە، پێڕ، تاقم، خێڵ, پۆل, ریز...). ئەوەیش لەیاد نەكەین كە لە ژیانی ڕۆژانەدا چەندین جار واتای (سێت) بەرجەستە دەبێت لە نێو ئەو كەرەستانەدا كە بەكاریان دەهێنین. بۆ نموونە, ئەگەر سێتێكی قاوە خواردنەوە پارچەیەكی دیار نەبێت, یەكسەر پێی دەزانین, چونكە ئەو پارچە نادیارە پەیوەندی (سێتایەتی) لەگەڵ پارچەكانی دیكەدا هەیە. لە وانەی ڕێزماندا, بە تایبەتی لە ڕێزمانی جێناودا, سیمای (سێتایەتی) زۆر زۆر كاریگەرە و ڕۆژانە مامۆستا و قوتابی بەكاری دەهێنن، بەڵام هێشتا لەوانەی ڕێزماندا نەبوە بە بابەت. بێگومان, وەك بیری منداڵ سرك و ژیر و زرنگە، ڕەنگە بەپێش مامۆستا بكەوێت و هەر بە پەیوەندی (سێتایەتی) بتوانێت هەندێك هەڵە ڕاست بكاتەوە, یان هەندێك نموونەی باس نەكراو بخاتە بەر بەرەو. بە هیوایین بتوانین نەختێك برەو بدەین بە ئەو بابەتە گرنگە و بتوانین مامۆستایانی بەڕێز لە كەڵكی (سێتی ڕێزمانی) نزیك بكەینەوە.

## ٢/٦: مۆرفیمی ئێستایی (ـە):

بۆ نموونە، ئەگەر ڕوو بکەین لە ڕستەیەك، وەك: (ئەو جوانــە)، ئەوا نموونەیەك دروست دەبێت بۆ کەسی سێیەمی تاك. ئەمە و وەك سێ کەسی ڕێزمانی هەیە، دەتوانین ئەو ڕستەیە بدەین لە هەرسێ کەسەکە (من، تۆ، ئەو) وەك: (من جوانــم، تۆ جوانــیت، ئەو جوانــە). ئەو ڕستانە سێتێکی بنەڕەتی و (سیانی) پڕ دەکەنەوە، بەڵام ئەوسێتە دیوی (کۆ)ی هەیە وەك: (٢×٣=٦):

من جوان(م): ئێمە جوان(ین)
تۆجوانی(یت): ئێوە جوان(ن)
ئەو جوان(ە): ئەوان جوان(ن)

لە ئەم سێتە شەش کەسیەدا، تەنیا هەرکەسی ڕێزمانی گۆڕاوە، بەڵام لە گەڵ مۆرفیمی ئێستاییدا (سێت) دروست بوە، وەك:

سێت = (م، یت، ە، ین، ن، ن)

وەك ئەو پارچانە بوون بە ئەندامی یەك (سێت)، دەشێت و دەبێت یەك ناوی ڕێزمانییان لێ بنرێت لە بۆ ئەوەی جودا ببنەوە لە سێتە هاوڕوخسارەکانی تر. ئەوەیش لە یاد نەکەین کە ئەندامانی ئەو سێتە (خزمایەتی)یەکی پتەو لە نێوانیاندا هەیە و ئەوەی لە بۆ مۆرفیمی ئێستایی دەگوترێت، دەشێت بۆ ئەوانی دیکەیش ڕاست بێت. لە ڕووی بەراوردەوە، لەگەڵ زمانانی دیکەدا، ئەندامەکانی ئەو سێتە ڕێزمانیە بریتین لە (کار) لە زمانی ئینگلیزیدا و بەرانبەر بە ڕێژەکانی (am-is-are) دەوەستن. کەواتە، بەکارهێنانی سێتی ڕێزمانی (ناسنامە)ی بابەتەکان دەردەخات و ڕێژەکانی کاری (بوونی ئێستایی) بە جوانی بە تەواوی دەدۆزێتەوە. بەرانبەر بەئەم نموونانە، ئەگەر کارێکی

دیکە وەربگرین. وەك (کەوتن)، ئەوا ڕیزێکی دیکە پەیدا دەبێت، وەك:

من کەوت (م): ئێمە کەوت (ین)
تۆ کەوت (یت): ئێوە کەوت (ن)
ئەو کەوت (-): ئەوان کەوت (ن)

کەواتە سێتە ڕێزمانیەکە ڕوخسار دەگۆڕێت و دەبێت بە:

سێت= (م، یت، -، ین، ن، ن)

ئێستا ئەگەر ئەندامانی هەر دوو سێتەکە بەراورد بکەین، دەبینین کە جیاوازییەك هەیە و گشت ئەندامەکانی هەر دوو سێتەکە بەتەواوی نابن بە یەك. لە ڕووی ڕێزمانەوە، ئەو دوو سێتە دەبێت دوو ناوی ڕێزمانی جیاوازیان هەبێت، هەر بۆ پراوە، لەزمانی ئینگلیزیدا جێناوی (م) بەرانبەر بە (I am) دەوەستێت بەلآم هەمان جێناو (م) لە سێتی دووەمدا بەرانبەر بە (I) دەوەستێت. کەواتە، لە سێتی یەکەمدا هەر ئەندامێك بریتیە لە ڕێژدیەکی کاری بوونی ئێستایی (verb to be) و لە سێتی دووەمدا هەر ئەندامێك بریتیە لە (جێناو)ێك.

### ٦/٣: کاری (ڕاگەیشتن):

لە ئاستی سێتی ڕێزمانی، هەر کارێکی تێنەپەڕی وەك (گەیشتن) سێ ڕوخساری بنەڕەتی هەیە، وەك: (گەیشتن، گەیاندن، گەیەنران). ئێستا ئەگەر یەکێك لە ئەندامانی ئەم سێتە پارچۆلکەیەك وەربگرێت. وەك پاشگری دووپاتی (دوە)، ئەوا هەرسێ ئەندامەکە دەبێت وەری بگرن: (گەیشتنەوە، گەیاندنەوە، گەیەنرانەوە). بێگومان، هەر سێ ئەندامی سێتەکە پاشگری (دوە)یان وەرگرتوە و هەرسێکیان واتایان گۆڕاوە و واتایەکی تازە پەیدا

بوە. بەرانبەر بە ئەم دیاردەیە, دەشێت ڕوو بكەینە پێشگری واتا گۆڕ (ڕا), كە دەچێتە سەر كاری (گەیانـدن) و دەی كـات بـە (ڕاگەیانـدن), وەك: (ڕاگەیشـتن، ڕاگەیانـدن، ڕاپەڕاندن). لەم ئاستەدا, سەرنجێكی ورد لە هەردوو سێتەكە دەری دەخات كە چاوگی (ڕاگەیاندن و ڕاگەیەنران) برەویان هەیە و هیچ درێغیەك نانوێنن لە (ئاخاوتن)دا, كەچی چاوگی (ڕاگەیشتن) سستە و لە زمانی ڕۆژانەدا برەوی نیە. كەواتە, سێتە ڕێزمانیەكە كەلكێكی بەخشی و كارێكی لەچەشنی (ڕاگەیشتن)ی دۆزیەوە. هەر بۆ پرۆڤە, بۆچی بتوانین بڵێین: (من ڕاگەیەنرام), ئەدی بۆچی نەتوانین بڵێین: (من ڕاگەیشتم), لەسەر ئەندازە و پێوانەی: (من گەیشتم). لە ڕاستیدا, ئەگەر سێتی ڕێزمانی بكەوێتە كار دەشێت گشت تاقمەكان یەك بخرێنەوە و دەشێت هەر پارچەیەكی (سەرگەردان) بگەڕێتەوە بۆ نێو ئەو كلۆرییەی كە لە جەستەی سێتەكەدا بەجێی هێشتوە.

### ٤/٦: چاوگی (بكەر نادیار):

وەك لەكاری (ڕاگەیشتن)دا بەكار هێنرا, هەر كارێك دەتوانێت سێ جۆر لە ڕێژە پڕ بكاتەوە لە هەمان (دەمكات)دا, وەك:

- بە تێنەپەڕی, وەك:

من گەیشتم: ئێمە گەیشتین
تۆ گەیشتیت: ئێوە گەیشتن
ئەو گەیشت: ئەوان گەیشتن

- یان، بە تێپەڕی, وەك:

من گەیاندم: ئێمە گەیاندمان
تۆ گەیاندت: ئێوە گەیاندتان
ئەو گەیاندی: ئەوان گەیاندیان

یان, بە بکەرنادیاری, وەك:

من گەیەنرام: ئێمە گەیەنراین

تۆ گەیەنرایت: ئێوە گەیەنران

ئەو گەیەنرا: ئەوان گەیەنران

بێگومان, سێ گرووپ لە ڕێژە پەیدا بوون و دەشێت هەر یەك لە ئەو گرووپانە بە (چاوگ)ێك بناسینەوە. لە زمانی کوردیدا، گشت ڕێزماننووسێك دەزانێت کە دەستەی یەکەم بە هوردی و بەسفتی لە پەرێزی چاوگی (گەیشتن)دا جێیان دەبێتەوە ، بە هەمان شێوە نموونەکانی گرووپی دوەم لە پەرێزی چاوگی (گەیاندن)دا جێیان دەبێتەوە. پاشان, ئەگەر سەرنج بخەینەسەر نموونەکانی گرووپی سێیەم, دەتوانین پەرێزێك بۆ چاوگێك لە چەشنی (گەیەنران) دروست بکەین. کەواتە, چاوگیش سێتی هەیە لە بەستندا:

**سێت = گەیشتن، گەیاندن، گەیەنران**

بە واتایەکی دی, بە بڕشتی (سێت) توانیمان جۆرێك لە چاوگ بدۆزینەوە لە چەشنی (چاوگی بکەر نادیار) و مۆرکێکی دی بۆ زمانەکان دیاری بکەین, کە لە زمانە بەرچاویەکاندا بردوی نیە. بێگومان ڕێزماننووسان هەر دەبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان (چاوگی بکەرنادیار) لە گەڵ دووجۆرەکەی دیکەدا ڕیز بکەن, چونکە:

١- چاوگی بکەرنادیار (ڕاگەیەنران) یەك پارچەیە, وەك: چاوگەکانی دیکە (گەیشتن، گەیاندن).

٢ چاوگی بکەرنادیار گشت کاری زمانەکە دەگرێتەوە, چی (تێنەپەڕ) و چی (تێپەڕ).

٣ چاوگی بکەرنادیار هێزی تێپەڕینی خۆی هەیە و بە چاوگی (تێنەپەڕ) ناسراوە.

٤ چاوگی بکەرنادیار بریتیە لە دایکی ڕیزە وشەیەکی داڕێژراو لە چەشنی (نووسراو، کوژراو، گەیەنراو، هەڵکراو، سووتێنراو، کەوێنراو، جووڵێنراو، ...)

کەواتە، هەر ڕێزماننووسێك ئەگەر بیەوێت قاوغی ڕێزمانی زمانانی تر بشکێنێت، دەشێت لەئەوە تێ بگات کە ئەم زمانە سروشتیەی ئێمە، وەك زمانی میللەتانی دیکە، مۆرکی تایبەتی خۆی هەیە و ئەو مۆرکە دەبێت بەرجەستە بکرێت بەڕێزمان.

### ٦/٥: کارەکانی جووڵە و بزووتن:

وەك لە ڕێزمانی کوردیدا زانراوە: هەر کارێکی تێنەپەڕ بۆی هەیە بە کەرەستەی (ێن) ببێت بە (تێپەڕ)، وەك:

سووتان: سووتاندن

کەوتن: کەواندن

خەوتن: خەواندن

لە ڕاستیدا، ئەم سێتە دوانیە بەرکراوەیە و ڕووبەری گشت کارە تێنەپەڕەکان دەگرێتەوە، بەڵام لە ئاستی چەند کارێکدا دادەمێنێت، وەك:

ڕۆیشتن، چوون، هاتن

لە زمانی کوردیدا، بە جۆرێك لە زۆرەملێی ڕێزمانی سێتە ڕێزمانیەکە بەسەریاندا چەسپێنراوە، وەك:

ڕۆیشتن: ڕواندن

چوون: پواندن

(دەر) چوون: (دەر) چواندن

(دا) چوون: (دا) چواندن

(هەڵ) چوون: (هەڵ) چواندن

(ڕۆ) چوون: (ڕۆ) چواندن

یان وەك:

هاتن: هێنان: هانین

(دەر)هاتن: (دەر)هێنان: (دەر) هانین

(هەڵ) هاتن: (هەڵ) هێنان: (هەڵ) هانین

(دا) هاتن: (دا) هێنان: (دا) هانین

(ڕا) هاتن: (ڕا) هێنان: (ڕا) هانین

بێگومان, گشت كوردیزانێك دەزانێت كە جیاوازیەكی بنەڕەتی هەیە و كرۆكی سێتە ڕێزمانی (سووتان: سووتاندن) بە جوانی و بە سفتی نەچەسپاوە، وەك:

١- چاوگەكانی (ڕواندن، چواندن، هانین) سیمای چەكووشكاریەكی نابەجێیان پێوە دیارە.

٢- چاوگی (هێنان) لە چاوگێكی سەربەخۆ دەچێت و ئەو چاوگە كلۆری سێتەكەی پڕ كردوەتەوە, وەك چۆن كاری (خستن) لە جیاتی كاری (كەواندن) بەكار دەهێنرێت.

كەواتە, چەند كارێك لە چەشنی (ڕۆیشتن، چوون، هاتن) جودا دەبنەوە و بۆ سێتەكە ملكەچ نابن. هۆی جودا بوونەوەی ئەم چاوگانە لە چاوگە تێنەپەڕەكانی دیكە بۆ چەند ڕاستیەك دەگەڕێتەوە وەك:

١- ئەم كارانە جوولە و بزووتن دەنوێنن و بكەرەكەیان چالاكە, بەلاّم كارەكانی دیكە ڕووداوێك پیشان دەدەن كە (بكەر)ەكەیان سستە.

٢- بكەری ئەو چاوگانە (وزە) خەرج دەكات. واتە, سەرچاوەیەكی وزە پێویستە وەك: (پیاوەكە ڕۆیشت).

٣- چاوگی (ئاندن) گشت کاتێك بکەرێکی سست لا دەبات و بکەرێکی کارا دادەمەزرێنێت, هەر لە بەر ئەوە, ناتوانێت بکەری کارەکانی بزووتن لابدات, چونکە چالاك و کارایە.

### ٦/٦: کاری (ناساندن):

ئەگەر سەرنج لە کارە تێپەڕەکان بدەین، دەبینین کە هەر هەموویان سێتێکی دوانی دروست دەکەن, وەك:

ناسین: ناسران

کوژتن: کوژران

کێلان: کێلران

خواردن: خوران

مژین: مژران

ئەمجا, ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر کارە تێنەپەڕەکان, دەبینین کە سێتێکی سیانی دروست دەکەن, وەك:

سووتان: سووتاندن: سووتێنران

کەوتن: کەواندن: کەوێنران

خەوتن: خەواندن: خەوێنران

سەبارەت بە مەبەستی ئەم کۆپلەیە, دەبینین کە کاری (ناساندن) لە دەستەی یەکەمە و کەچی سێتەکەی دەستەی دووەمی پەسەند کردوە, وەك: (**ناسین: ناساندن:**

**ناسێنران)**. کەواتە، یاساکانی ڕێزمان کورت دەهێنن، ئەوەتا کاری (ناسین) تێپەڕە، کەچی جارێکی دیکە کراوە بە (تێپەڕ). بێگومان، بە ئەم کردەوە دەگمەنەی کاری (ناسین) هەردوو سێتەکە دەکەونە گەڕ. بە بۆچوونی ئێمە، وەك چۆن کاری تێپەڕی (ناسین) هەیە، هەر ئاوهاش کاری تێنەپەڕ (ناسان)یش هەبوە. هەر بۆ نموونە، چەندین کاری دیکە هەن، کە هێزی تێ پەڕینیان بە (نیشانەی ڕابردوو) دەگۆڕێت، وەك:

| تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|
| گۆڕین | گۆڕان |
| دڕین | دڕان |
| بڕین | بڕان |
| مژین | مژان |

ئەوەی سەیرە، ئەوەیە کە کاری تێپەڕی (ناسین) سێتی (ناسین: ناسران)ی دروست کردوە و کاری (ناسان)یش سێتی (ناسان: ناساندن: ناسێنران)ی دروست کردوە. هۆی ئەم تەم مژە و لێڵیە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە کاری (ناسان) سست بوە و لە بەرچاو نەماوە، بەڵام دیوی (ناساندن) و (ناسێنران)ی ماوەتەوە. جوانترین بەڵگە بۆ ئەم ڕاستیە ئەوەیە کە کاری تێپەڕی (ناسین) واتای (ناساندن) نادات، بەهەمان شێوە چاوگی (ناسران)یش واتای چاوگی (ناسێنران) نادات. کەواتە، ڕەنگە ریسای (سێتایەتی) توانیبێتی ئاسەواری کارێك بدۆزێتەوە لە چەشنی (ناسان)، کە ڕەنگە شەش ڕێژە دروست بکات، لە چەشنی:

من ناسام: ئێمە ناساین

تۆ ناسایت: ئێوە ناسان

ئەو ناسا: ئەوان ناسان

تـۆ بلێیـت, لـە گۆشـەیەكی ئـەم نیشـتمانەدا ئـەم جـۆرە بـەكار هێنانـە بـرەوی هەبێت.

### ٧/٦: ئامرازی پەیوەندی (لە):

هەردوو ئامرازی پەیوەندی (لە) و (بە) سێتێكی سیانی پێك دەهێنن لە چەشنی

(لەـ: لە ـ ەوە: لە ـ دا)

(بە ـ بە ـ ەوە: بە ـ دا)

ئەم سێتانە دەشێت ناوێك وەربگرن, وەك:

لە (هەولێر): لە (هەولێر)ەوە: لە (هەولێر)دا

یان دەشێت جێناوی جودا بەكار بهێنین وەك:

لە (تۆ): لە (تۆ)ەوە: لە (تۆ)دا

بە (تۆ): بە (تۆ)ەوە: بە (تۆ)دا

ئێستایش, ئەگەر ئەم سێتە سیانیە بخەینە بەر (جێناوی لكاو) وەك:

لێ(ت): لێ(ت)ەوە : (لێتدا)

پێ(ت): پێ(ت)ەوە: پێ (ت)دا

دەبینین کە ڕوخساری (لەتۆدا) ناشێت بکرێت بە (لێیتدا*). کەواتە, بە زەبری (سێتایەتی) توانیمان دیاردەیەکی سەیر بدۆزینەوە. ئەوەی سەیرە دەگۆترێت: (نامەکەم پێتدا نارد), کەچی ناگوترێت: (نامەکەم لێیدا گرت)*, بەرانبەر بە (نامەکەم لە ئەودا گرت).

### ٨/٦: پوختەکاری:

- بۆ زمانی کوردی, کە زمانێکی زۆر ئاڵۆزە و ڕێزمانەکەی زۆر بێ خزمەتە, ڕێزمانی (سێتایەتی) کەلکێکی گەورە دەبەخشێت بە تایبەتی لە هۆبەکانی خوێندن و لە ناوەندەکانی توێژینەوەی زمانەوانیدا.
- ئەگەر ڕێزمانی (سێت) بکەوێتە کار, منداڵە چاوگەشەکان کەرەستەیەکیان دەست دەکەوێت کە مامۆستاکان تەنگەتاو بکەن، بە پرسیاری (دروست و بەجێ) و بە ڕەخنەی (کاریگەر و بنیادنەر).
- لە سێتی ڕێزمانیدا، پێویستە گشت ئەندامەکانی سێتەکە بخەینە کار بۆ ئەوەی بگەینە بنی گۆمە لێخەکان.
- بە برشتی (سێتی ڕێزمانی), دەتوانین هێڵی سووری ڕێزمانی لە نێوان بابەتەکاندا بکێشین و دەتوانین هەر بابەتێك بخەینە سەر ڕەفەی خۆی لە کتێبخانەی نێو بیری منداڵاندا.
- بۆ نموونە, لە ڕێزمانی تۆمارکراودا, جیاوازی نێوان ئەم دوو لاسێتە جێناوە:(م، یت، ــ، یت، ن، ن) یان (م، یت، ە، ین، ن،ن), هەر لە کەسی سێیەمی تاکدایە, چونکە دیارە لە ڕێزمانی ئێستایەتیدا هەر شەش ئەندامەکەی هەردوو سێتەکە لە یەکدی جودا دەبنەوە. بۆ نموونە, جێناوی (م) لە گرووپی یەکەمدا بە هیچ جۆرێك یەکسان نیە بە جێناوی

(م) لە سێتەکەی دیکەدا، بە هەمان شێوە هەر شەش ئەندامەکەی سێتی یەکەم خزمی یەکدین و هاوجێن، بەلاّم ئەندامەکانی سێتەکەی دیکە بریتین لە سێتێکی سەربەخۆ، لەگەڵ ئەوەیشدا هەرچەندە کە خزم و هاوجێ بن، بەلاّم لە ڕێسای سێتایەتیدا هەردوو سێتەکە لە یەکدی جودا دەبنەوە.

- لە نێو ئەم نووسینەدا، زەبری (سێتی ڕێزمانی) گەیشتنە چەند بابەتێکی دەگمەن، وەك:

- ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ە)
- ڕوخساری کاری (ڕاگەیشتن).
- هەبوونی چاوگی (بکەر نادیار).
- تایبەتمەندی لە کارەکانی (بزووتن)دا
- تایبەتمەندی لەکاری (ناسان)دا
- نەبوونی ئامرازی پەیوەندی (لێ دا)

بێگومان، ئەم بابەتانە بە زەبری زمانی ئەدەبی باس دەکرێن، بەلاّم مەرج ئەوەیە کە بە شرۆڤەکاری زانستیەوە بێخ و بنجیان بۆ منداڵە چاو گەشەکان دەربهێنن. لە ئەم ڕووەوە، ڕێزمانی (سێت) کاریگەری زانستی خۆی هەیە و ناهێڵێت بیری مامۆستایان، یان بیری قوتابیان، لە ئاستی ئەو بابەتە هوردانە پەرت ببێت و چاوی بیر گێلەیان تێدا بکات. لە گەڵ ئەوەیشدا، لە وانەکانی ڕێزماندا بە ڕەهایی دەرگای گفتوگۆ و گەنگەشە دەکاتەوە.

**٩/٦: بەرەنجامی پێشکەوتوو:**

سێتی ڕێزمانی بریتیە لە ئەو پەیوەندیەی کە چەند ئەندامێك یان چەند پارچەیەك دەبەستێت بە یەکەوە، بۆ نموونە, سێتە جێناوی دوەم (م، ت، ی، مان، تان، یان) بریتیە لە سێتی ڕێزمانی. یان, سێتە جێناوی یەکەم سێ لاسێتی هەیە, وەك:

لاسێتی (١): (م، یت، ێت، یت، ن، ن)

لاسێتی (٢): (م، یت، ـ، یت، ن، ن)

لاسێتی (٣): (م، یت، ـە، یت، ن، ن)

لە سێتی دوەم و لە ئەو سێ لاسێتەدا, تەنها جێناوی (م) چوار جار دووبارە بوەتەوە, ئەو جێناوانە جیاوازن لە یەکتری چونکە سێتەکان و لاسێتەکان جیاوازن, وەك:

- لە لاسێتی (١)دا, جێناوی (م) سادەیە, جێنەگۆڕە, هەر ڕۆڵی (بکەر) دەبینێت, لە سیستمی ئەکیووزەیتیڤە, هەر لە ڕانەبردوو بەکار دەهێنرێت.
- لە لاسێتی (٢)دا, جێناوی (م), سادەیە, جێنەگۆڕە, ڕۆڵی (بکەر) دەبینێت لە کاری تێنەپەڕدا و ڕۆڵی بەرکاریش لە کاری تێپەڕدا, لە سیستمی ئێرگەیتیڤە و هەر لە ڕابردوودا بەکار دەهێنرێت.
- لە لاسێتی (٣)دا, جێناوی (م), ناسادەیە و مۆرفیمی ئێستایی (ـە)ی شاردوەتەوە, جێنەگۆڕە, ڕۆڵی (بکەر) دەبینێت لە کاری تێنەپەڕدا و ڕۆڵی بەرکاریش لە کاری تێپەڕدا, لە سیستمی ئێرگەیتیڤە و هەر لە ڕانەبردووی (بوون و هەبوون) و (ڕابردوو تەواو)دا بەکار دەهێنرێت.

- لە سێتی (دوەم)دا, جێناوی (م), سادەیە, جێگۆڕە, ڕۆڵی (بەرکار) دەبینێت لە کاری لە ڕانەبردوودا (سیستمی ئەکیووزەیتیف), ڕۆڵی (بکەر) دەبینێت لە (بوون و هەبوون) و لە ڕابردوودا (سیستمی ئیرگەیتیف), لە سیستمی ئیرگەیتیڤدا ئالۆودەیە بە بەرکارەوە و ئەگەر هیچ (بەرکار)ێك لە ڕیزەکەدا نەبێت, ئەوا جێناوی نادیاری کەسی سێیەمی تاك دەکات بە (بەرکار).

بە ڕاستی, ئەوەی گوترا بریتی بوو لە جیاوازی جێناوی (م) لە هەر سێتێکدا, یان لە هەر لاسێتێکدا, بەڵام ئەوەی لە ئەو چوار جێیەدا بۆ جێناوی (م) گوترا, بۆ هەر پێنج ئەندامەکەی تریش هەر ئاوهایە. کەواتە, ئەوەی لە ئەو خاڵانەی سەرەوەدا گوتراوە, هەر بۆ جێناوی (م) نەگوتراوە, بەڵکوو بۆ ئەو سێتە نووسراوە کە ئەو جێناوەی تێدا ئەندامە. بە ڕاستی, گەمەی سێتایەتی هێندە بەکار و کاریگەرە ڕەگ و ڕیشاڵی ئارێشەکان دەدۆزێتەوە لە ئەو بەزم و ڕەزمە ئاڵۆزەی ڕێزماندا و کۆتایی دەهێنێت بە باڵۆرەی وت و وێژە بێ سەرەداوەکان. سەرەڕای ئەوانە, سێتی ڕێزمانی ڕێگا دەکاتەوە کە ڕێزمانێکی ئەکادیمیانە بنووسینەوە, بە بڕشتی خشتە و نەخشە.

**سەرچاوە:**

**کەڵك لە ئیشەکانی خۆمان وەرگیراوە، ئەوبابەتانەی کە لە پێشتردا بڵاو کراونەتەوە.**

## بابەتی حەفتەم

# کاری ئاراستەدار و کاری ئامرازدار لە رێزمانی کوردیدا

**١/٧: دەستپێك:**

لە زمانەکەدا، چەند کارێك هەن دیوێکی دیکەیان هەیە، لە ئەو دیوەدا ئامرازی پەیوەندی هەڵدەگرن. بۆ نموونە، کارەکانی (گەیشتن، دان، ناردن... هتد) دەتوانن ببن بە (گەیشتن بە...، دان بە...، ناردن بۆ...، ...). لەڕاستیدا، ئەم دیاردەیە زۆر زۆر بەرفراوانە لە زمانی کوردیدا و ئارێشەیەکی گەورەی ناوەتەوە و زۆرجار بە نارەوایی لێکدەدرێتەوە. هەر لە بەر ئەوە، ئەم جۆرە کارە دەشێت بە دانسقەیی جودا بکرێنەوە و توێژینەوەیان لە سەر بکرێت. بەداخەوە، لە زمانەکەدا هێشتا کێشەی ئامرازی پەیوەندیی بە جوانی خزمەت نەکراوە و هێشتا رێزماننووسان ئەو بایەخەیان بە ئامرازی پەیوەندی نەداوە، کە پێویستە پێی بدرێت. ئەمە و لە زمانی ئینگلیزیدا، ئەگەر شەش هەزار کار تۆمار کرابێت، ئەو کارانە ژمارەیان دەبێت بە سیازدە هەزار کار. بە برِشتی ئەو ئامرازانەی کە هەڵی دەگرن. ئەو جۆرە کارەیش بە (Phrasal Verbs) ناسراوە. واتە، بە (کاری دارِێژراو بە ئامراز) ناوبراون. لە زمانی کوردیدا نە ئامارێك هەیە و نەزانراوە کە ژمارەی ئەو جۆرە کارە چەندە. ئێمە لە ئەو باوەرِەداین کە ئەم دیاردەیە لە زمانەکەی ئێمەدا زۆر چرِو پرِ و ئاڵۆزترە. لە راستیدا، ئەم کێشەیە پرِە لە ئاژاوە و هەرایەکی گەورە بەرپا دەکات، چونکە زمانەکە وەك پێویست خزمەت نەکراوە، بەتایبەتی لە گۆشەنیگای ئامرازی پەیوەندیەوە.

لەگەڵ ئەوەیشدا، ئێمە لە ئەو باوەرِەداین کە جۆرە بابەتی ئاوها بنچینەیی خزمەتێکی گەورە پێشکەش دەکات بە زمانەکە و ئەو دەرگایانە دەکاتەوە، کە بە ئاسانی، بە رێزمانی زمانانی دیکە، ناکرێنەوە. بە هیوایین بتوانین نەختێك تروسکایی بخەینەسەر بابەتەکە و بتوانین دەرگایەك بکەینەوە بۆ گفتوگۆ و بۆ رەخنەی بەجێ.

**٢/٧: خشتەی ئامرازی پەیوەندی:**

لە سەر نەخشەی (١/٧)، ئامرازەكانی پەیوەندی ریز دەكەین، بۆ ئەوەی بتوانین لە بابەتەكانی داهاتوو كەڵكیان لێ وەربگرین. لە ئەو خشتەیەدا، چەند راستیەك هەیە، وەك:

**یەكەم:** لە رێزمانی كاردا, سێ ئامرازی بنەڕەتی دیاریكراون، وەك (بۆ، بە، لە).

**دووەم:** ئامرازەكانی (بە) و (لە) دەتوانن دوو پاشپرتی وەك (دا) و (ەوە) وەربگرن بۆ ئەوەی سێ دیویان هەبێت بۆ سێ بەكارهێنانی جیاواز.

**سێیەم:** ئامرازەكانی (بە) و (لە) روخساری لكاویان هەیە، وەك (پێ) و (لێ) و ئەو ئامرازانەیش دەتوانن هەردوو پاشپرتەكە وەربگرن.

**چوارەم:** ئامرازی (لە) دوو روخساری لكاوی هەیە، وەك (لێ) و (تێ).

**پێنجەم:** ئامرازی (بۆ) نە پاشپرت وەردەگرێت و نە شێوەی لكاوی هەیە.

| ئامرازی جودا | ئامرازی لكاو | |
|---|---|---|
| | جۆری یەكەم | جۆری دووەم |
| بۆ ــ | بۆ ــ | ــ |
| بە ــ | پێ ــ | ــ |
| بە ــ دا | پێ ــ دا | ــ |
| بە ــ ەوە | پێ ــ ەوە | ــ |
| لە ــ | لێ ــ | تێ ــ |
| لە ــ دا | ــ | تێ ــ دا |
| لە ــ ەوە | لێ ــ ەوە | تێ ــ ەوە |

نەخشەی (١/٧): ئامرازەكانی پەیوەندی

### ٣/٧: دابەشبوونی ئامرازی پەیوەندی:

ئامرازی پەیوەندی بە دوو ڕێگا دادەبەزێتە نێو ڕێزمانی ڕستە، وەك:

**ڕێگای یەکەم**: دابەزینی ئامرازی پەیوەندی بۆ نێو پێکهاتەی سەرەکی لە ڕستەدا، کە بریتیە لە (کار). لە ئەم دیاردەیەدا، ئامرازی پەیوەندی بارگەیەك لە چەشنی (کۆمەڵەی ناو) هەڵ دەگرێت و ئەو بارگەیە دەبەستێت بە (بکەر)ەوە، یان (بەرکار)ی ڕستەکەوە. بۆنموونە، کە دەگوترێت:

شیلان گەیشت بە (هەولێر)

پەیوەندیەك پەیدا دەبێت لە نێوان بکەری ڕستەکە (شیلان) و بارگەی ئامرازی پەیوەندی (هەولێر). یان، لە نموونەیەکی دیکەدا، وەك:

من نامەکەم (برد بۆ (ئەو)

پەیوەندیەك پەیدا دەبێت لە نێوان بەرکاری ڕستەکە (نامەکە) و بارگەی ئامرازەکە (ئەو). ئەمە و ڕەنگە ئەم دیاردەیە بایەخی نەبێت، بەڵام دوو دیو ڕیز دەکات بۆ چاوگ، وەك:

| کاری بێ ئامراز | کاری ئامرازدار |
|---|---|
| دیوی (گەیشتن) | دیوی (گەیشتن بە .....) |
| دیوی (بردن) | دیوی (بردن بۆ .....) |

**ڕێگای دووەم**: لە ئەم ڕێگایەدا، ئامرازەکە ڕوودەکات لە ئاوەڵگوزارەیەکی پەتیو ئەو ئاوەڵگوزارەیە دەبێت بە ڕایەخێك بۆ ئەوەی ڕستەکەی لە سەر ڕابخرێت، وەك:

| | |
|---|---|
| لەلای نێوە | ئامەکە دەنووسین |

لە ئەم دەستەواژەیەدا، ئاوەڵگوزارەكە هیچ دەستدرێژیەك ناكات لە پێكهاتەكانی رستە، وەك لە رێگای یەكەم روودەدات، بەڵكوو قەوارەی رستەكە لە ئامێز دەگرێت و دەی خاتە جێیەكی دی. یان دەتوانین بڵێین: هیچ لە پەیوەندی نێوان پێكهاتەكانی رستەكە ناگۆڕێت، بەڵام هەر هەموویان بە بۆیەی ئاوەڵگوزارە بۆیاخ دەكات. بێگومان، ئەم جۆرەیان جێی مەبەست نیە لە ئەم نووسینەدا. واتە، تەنها ئەو ئامرازانە باس دەكەین كە دەچنە نێو پێكهاتەكانی رستەوە (رێگای یەكەم).

### ٤/٧: لیستی كاری ئامرازدار:

لە سەر نەخشەكانی (٢/٧) و (٣/٧)، دوو لیستە لە كاری ئامرازدار پێشكەش دەكەین. لیستەی یەكەم هەندێك لە كارە تێنەپەڕەكان پیشان دەداتو لیستەی دووەم هەندێك لە كارە تێپەڕەكان. لە ئەو نەخشانەدا، باری تایبەتی دەردەكەوێت و هەر كارێك وا بە ئاسانی، ناتوانێت هەر ئامرازێك وەربگرێت. بۆنموونە، كاری (گەیشتن) دەبێت بە (گەیشتن بە...)، بەڵام نابێت بە (گەیشتن بۆ)* یان، كاری (هاوێشتن) دەبێت بە (هاویشتن بۆ...) بەس نابێت بە (هاویشتن بە...)*. لە ئەم هەڵوێستەدا، ئەگەر كاری (هاویشتن بە...) بە دەستەواژەی (هاویشتن بە دەست) بناسین، ئەوا لە بەردەم كاری (هاوێشتن) و ئاوەڵگوزارەی (بەدەست) دەوەستین. لە لایەكی دیەوە، ئەگەر سەرنج بدەین لە دوو كاری دژ واتا وەك (فرۆشتن)و (كڕین)، دەبینین كە كاری (فرۆشتن) دەبێت بە (پێ فرۆشتن) و كاری (كڕین) دەبێت بە (لێ كڕین). یان، دەتوانین بڵێین، دەبن بە (فرۆشتن بە...) و(كڕین لە ...). لە ئەم ئاستەدا، ئەگەر زۆر لە ئامرازەكان بكەینو بڵێین (فرۆشتن لە ...)* و (كڕین بە...)*، ئەوا دەستدرێژیەكی گەورە دەكەین لە ئەو دوو كارە دژ واتایە و لە ئەو دوو ئامرازە تایبەتیە. لە ڕاستیدا، لە پێكهاتەی هەر كارێكدا باری تایبەتی هەیە،

وەك:

**یەكەم**: كاری وا هەیە بەهیچ جۆرێك ئامرازی پەیوەندی پەسەند ناكات لە پێكهاتنی قەوارەكەیدا.

**دووەم**: كاری وا هەیە، یەك ئامرازی پەیوەندی پەسەند دەكات لە قەوارەكەیدا.

**سێیەم**: كاری وا هەیە، پتر لە یەك ئامرازی پەیوەندی پەسەند دەكات لە قەوارەكەیدا.

**چوارەم**: ئەگەر بەپێی خاڵی سێیەم، پتر لە دوو ئامراز پەسەند كرا لە قەوارەی كارێكدا، ئەوا تەنها و تەنها هەریەكێكیان بۆی هەیە، كە دەربكەوێت لە یەك رستەدا.

**پێنجەم**: بەپێی خاڵەكانی پێشوو، لە یەك كارێكدا، هەریەك ئامراز پەسەندە. هەموو كارێك ئامرازی پەیوەندی پەسەند دەكات لە ئەو ئاوەڵگوزارەیەدا، كە دەبێت بە رایەخ و زەمینە بۆ رستەكەی.

| کار | کاری ناسادە | نموونە بۆ (ئامراز و بارگەی) |
|---|---|---|
| ئالآن | لێ ئالآن | دەزووەکە ئالآ (لە دەستم) |
| ترازان | لێ ترازان | تۆپەکە ترازا (لە دەستم) |
| ترسان | لێ ترسان | منداڵەکە ترسا (لە پشیلەکە) |
| خشان | لێ خشان | کراسەکەم خشا (لە دیوارەکە) |
| رۆیشتن | بۆ رۆیشتن | منداڵەکە رۆیشت (بۆ کۆلآن) |
| کەوتن | لێ کەوتن | دەستی کەوت (لە دەستم) |
| گەیشتن | پێ گەیشتن | دەستی گەیشت (بەدەستم) |
| نیشتن | لێ نیشتن | تۆزەکە نیشت (لە دیوارەکە) |
| هاتن | بۆ هاتن | شیلان هات (بۆ هەولێر) |
| چوون | بۆ چوون | شیلان چوو (بۆ هەولێر) |
| پەڕین | لێ پەڕین | بەردەکە پەڕی (لە دەستم) |
| چەقین | لێ چەقین | دەزریەکە چەقی (لەدەستم) |
| خزین | لێ خزین | کتێبەکە خزی (لەدەستم) |
| فڕین | بۆ فڕین | چۆلەکەکە فڕی (بۆ ئاسمان) |
| ..... | ..... | ..... |

خشتەی (٢/٧): کاری تێنەپەڕی ئامرازدار

| کار | کاری ناسادە | نموونە بۆ (ئامراز و بارگەکەی) |
|---|---|---|
| پێچان | لێ پێچان | پەڕۆکەم پێچا (لەدەستم) |
| دان | پێ دان | نامەکەم دا (بەدەستی) |
| دان | لێ دان | نامەکەم دا (لە دیوارەکە) |
| نان | لێ نان | بارەکەی نا (لە ولاْخەکە) |
| هێنان | بۆ هێنان | نامەکەم هێنا (بۆ ئەوان) |
| پاراستن | لێ پاراستن | ماڵەکەم پاراست (لە دزی) |
| خواستن | لێ خواستن | کتێبەکەم خواست (لە شیلان) |
| ژنەوتن | لێ ژنەوتن | وتەکەم ژنەوت (لە ئەو) |
| بیستن | لێ بیستن | وانەکەم بیست (لە ئەو) |
| فرۆشتن | پێ فرۆشتن | تۆپەکەی فرۆشت ( بە شیلان) |
| هاویشتن | بۆ هاویشتن | تۆپەکەی هاویشت (بۆ ئاسمان) |
| گوتن | پێ گوتن | نهێنیەکەم گوت (بە شیلان) |
| بردن | بۆ بردن | نامەکەم برد (بۆ شیلان) |
| سەندن | لێ سەندن | نامەکەم سەند (لە شیلان) |
| سپاردن | پێ سپاردن | نامەکەم سپارد(بە شیلان) |
| بەخشین | پێ بەخشین | پارەکەم بەخشی (بە شیلان) |
| بڕین | لێ بڕین | پارچەکەم بڕی (لە کوتاڵەکە) |
| بچڕین | لێ بچڕین | پارچەکەم بچڕی (لە کوتاڵەکە) |
| پرسین | لێ پرسین | پرسیارەکەم پرسی (لە شیلان) |
| کڕین | لێ کڕین | تۆپەکەم کڕی (لە شیلان) |
| ناردن | بۆ ناردن | تۆ پەکەم نارد (بۆ شیلان) |
| ..... | ..... | ... |

خشتەی (٢٩٧): کاری تێپەڕی ئامرازدار

### ٥/٧: پەسەندکردنی ئامرازی پەیوەندی:

وەك لە کۆپلەی پێشوودا باسکرا، پەسەندکردنی ئامرازی پەیوەندی. لە قەوارەی کاردا، بریتیە لە دیاردەیەکی زۆر زۆر هورد و ئاڵۆز. لە ئەوێدا, چەند خاڵێك پێشکەش کرا دەربارەی ئەو خزمایەتیەی کە لە نێوان (ئامراز) و (کار)دا هەیە. لە ئەم کۆپلەیەدا، هەموو ئەو خاڵانە ڕوون دەکەینەوە بە نموونە، وەك:

**یەکەم**: دەگوترێت کار هەیە کە ئامراز پەسەند ناکات لە قەوارەکەیدا بۆ نموونە. کاری (سووتان) هیچ ئامرازێك پەسەند ناکات و هەر ئامرازێك لە گەڵیدا دەربکەوێت لە ئاوەلگوزارەدایە(لاکێشە گەورەکە)، نەك لە قەوارەی کارەکەیدا (لاکێشە بچووکەکە)، وەك:

**دارەکە دەسووتێت** **بە ئاگر**

بە بەراوردێکی ژێرانە، دەبینین کە ئەم ڕستەیە جیاوازە لە ڕستەی:

**دارەکە دەگات بە ئاگرەکە**

**قەوارەی ڕستە**

خوێنەری زرنگ و ڕێزماننووسی پێشەوەر، دەتوانێت دەزووی ڕەش و سپی جودا بکاتەوە لە نێوان ئامرازی (بە) لە هەردوو نموونەکەدا, یان لە نێوان هەردوو کاری (سووتان و گەیشتن)دا.

**دووەم**: کاری وا هەیە یەك ئامراز پەسەند دەکات. بۆنموونە، کارەکانی نێو ئەو دوو خشتەیەی کە لە پێشەوە پێشکەش کران، هەر یەك ئامراز وەردەگرن. بۆ نموونە، کاری

(گەیشتن) دەبێت بە (گەیشتن بە) و (ناردن) دەبێت بە (ناردن بۆ)، وەك:

| |
|---|
| تۆپەکە گەیشت (بە) شیلان |
| تۆپەکەم نارد (بۆ) شیلان |

لە ئەم دوو نموونەیەدا، نەدەتوانین هەر ئامرازێك بە سەربەخۆیی دابنێین و نەدەتوانین جێی ئەو دوو ئامرازە بگۆڕین. کەواتە، ئەگەر کارێك یەك ئامرازی وەرگرت، ئەوا ئەو ئامرازە هەرەمەکی نیە و دیاریکراوە. بەواتایەکی دی، هەر کارێك ئامرازی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نموونە، ناتوانین بڵێین:

| |
|---|
| تۆپەکە گەیشت (بۆ) شیلان(*) |
| تۆپەکەم نارد (بە) شیلان(*) |

لە ڕاستیدا، جۆرە ڕستەی ئاوەها بزرکاو, لە ڕستەی کەسێك دەچێت، کە زمانی کوردی وەك (زمانی دوەم) فێربووبێت.

**سێیەم**: دەگوترێت هەندێك کار هەن کە پتر لە یەك ئامراز وەردەگرن. بۆنموونە کاری (دان) دەتوانێت هەردوو ئامرازی (بە) و (لە) وەربگرێت، وەك:

تۆ پەکە دەدەم بەتۆ

تۆ پەکە دەدەم لە دیوارەکە

لەڕاستیدا، هەردوو ئامرازەکە دوو دیوی تازە دروست دەکەن بۆ کاری (دان)، کە بریتین لە (دان بە.....) و (دان لە .....). ئەم دوو کارە لە باری لکاودا دەبن بە (پێ دان) و (لێ دان)، کە ڕۆژانە لە چالاکی ئاخاوتندا هەڵ دەسووڕێن. لە لایەکی دیەوە، لە ئەو دوو

کارەدا ناتوانین جێی ئامرازەکان بگۆڕین لە نموونەکاندا. لە جۆرە کرداری ئاوەهادا، دوو نموونەی (هەڵبزڕکاو) پەیدا دەبن.

**چوارەم**: لە پێشتردا گوتمان: لە هەر ڕستەیەکدا هەر یەك ئامراز پەسەندە. بۆ نموونە، لە کاری (دان)دا دوو ئامراز پیشان دران، بەڵام بۆ دوو دیوی جیاواز. لە ئەم هەڵویستەدا، هۆی دەرکەوتنی (یەك ئامرازێك)، لە قەوارەی کاری یەك ڕستەیەکدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئامرازی پەیوەندی بە یەك ڕەگەزی ڕێزمانی هەژمارکراوە لە ئەو قەوارەیەدا. هەر لە بەر ئەوە، هەر یەك ئامراز پەسەندە لە یەك کاردا.

**پێنجەم**: لە هەر ڕستەیەکدا، چەند ئامرازێك بۆی هەیە ڕیز ببێت، بەڵام تەنها هەر (ئامراز)ێك، لە ئەو ئامرازانە دەبێت بە پێکهاتەی کارەکە. بۆ نموونە، لە ڕستەی داهاتوودا، پێنج ئامراز ڕیزبووگن، بەڵام بە تەنها ئامرازی (بە)ی کۆتایی لە قەوارەی کاری (دان) دایە و ئەوانی دی لە قەوارەی ئاوەڵگوزارەدان، وەك:

لە بەر تۆ، لە هەولێر، لە ئێوارەدا، بە دەست، نامەکە دەدەم (بە) شیلان

ئێستا، ئەگەر فەرشی ئاوەڵگوزارەکان ڕابخەین، دەبینین کە چۆن هەریەکێکیان لە ئاستێکدا، ڕیزدەبن، نەخشەی (٤/٧). بەسەرنجێکی هورد، دەبینین، کە چوار زەمینەی ئاوەڵگوزارەیی ڕاخراوە لە ژێر ڕستەی (نامەکە دەدەم بە شیلان)دا. کەواتە، دەتوانین هەر زەمینەیەك لابەین، بەڵام ناتوانین دەست بدەین لە ئامرازی (بە) لە کاری (پێ دان)دا، چونکە دەگۆڕێت بۆ کاری (دان).




نەخشەی (٤/٧): رایەخەکانی ئاوەڵگوزارە لە ژێر قەوارەی رستە

### ٦/٧: ئاراستە لە رێزمانی کاردا:

هەندێك لە کاری زمانەکە بێبەریە لە (ئاراستە)، وەك (خەوتن، نووسین، نووسین، ...). لە بەرانبەردا، لە هەندێك کاردا ئاراستە هەیە، وەك (رۆیشتن، هاتن، بردن، ناردن، ...) لە ئەم هەڵویستەدا، دەتوانین رووبکەین لە چەند سەرنجێکی هورد، کە لە ئاستی ئاراستەی کاردا تۆمار کراون، وەك:

**یەکەم**: هەندێك کار هەیە کە هەر بە رووتی و بەبێ هیچ رەگەزێکی سەربار ئاکاری ئاراستەداری دەبەخشێت. بۆ نموونە، کاری (کەوتن) و (نیشتن) واتای ئاراستەیەك دەبەخشن لە چەشنی شاوڵی (بەرەو نشێو)، وەك:

**کاری (کەوتن ↓ ): کاری (نیشتن↓)**

یان هەندێك کار هەن واتای ئاراستەی ستوونی (بەرەو هەوراز) دەبەخشن، وەك:

**کاری (فڕین ↑ ): کاری (هەڵستان ↑ )**

سروشتی ئاراستەکە لە ئەم جۆرە کارانەدا هەرچەندە ستوونی نەبێت بە تەواوی، بەڵام پێکهاتەیەکی ستوونی تێیدا هەیە (Vertical Component)، بەتایبەتی لە واتای ڕووداوەکەدا.

**دووەم**: هەندێك کار هەن کە جێگای ئاخێوەرەکە ئاراستەکەیان دیاری دەکات. بۆنموونە، ئەگەر ئاخێوەرەکە بێ بایەخ بکەین، ئەوا واتای کاری (ڕۆیشتن) و (هاتن) دەبن بەیەك (ڕووداو)، هەرچەندە کە ئاراستەیان پێچەوانەیە. هەر لە بەر ئەوە، لە بەردەم هەر کارێکدا دەتوانین دوو تیری دژ ئاراستە دابنێین، وەك:

| |
|---|
| کاری (هاتن ⇄): کاری (ڕۆیشتن ⇄) |

لە ئەم هەڵویستەدا، ئەگەر ئاخێوەرەکە لە لای (ڕاست) یان لە لای (چەپ) دیاری بکەین، ئەوسا دەتوانین ئاراستەی تیرەکان دیاری بکەین و ئەو ئاراستە دوولایەنە یەکلایی بکەینەوە. بۆ نموونە، ئەگەر ئاخێوەرەکە لە لای (ڕاست) ڕاوەستا، ئەم نەخشەیە پەیدا دەبێت:

| | |
|---|---|
| ئاخێوەر | (هاتن ⟶): (ڕۆیشتن ⟵) |

بە هەمان شێواز، ئەگەر ئاخێوەرەکە چووە لای (چەپ)، ئەوا ئاراستەی تیرەکان دەگۆڕێت و هەر کارێك لە ئەو دوانە، ئاراستەی پێچەوانە پەسەند دەکات، وەك:

| | |
|---|---|
| (هاتن ⟵): (ڕۆیشتن ⟶) | ئاخێوەر |

**سێیەم**: لە هەندێك کاردا، ئاکاری (گواستنەوە) لە واتای کارەکەدا هەیە، بەڵام ئاراستەکەی دیاری نەکراوە. بۆنموونە لە کاری (گەیشتن)دا ئاراستە هەیە، بەڵام

دەرنەخراوە، کە رووکارەکەی لە کوێیە. لە ئەم جۆرەکارەدا، تەنها ئامرازی پەیوەندی و بارگەی ئامرازەکە دەتوانن ئاراستەکە دیاری بکەن. کەواتە، ئەگەر گوترا (نامەکە گەیشت) دەبێت ئامرازی (بە...) بەکاربهێنین بۆ گەیاندنی ئاراستەی کارەکە بەناوی (شیلان)، وەك نامەکە گەیشت (بە شیلان)

**٧/٧: بەرەنجام و پوختەکاری:**

- لە رووداوی هەندێك کاردا بزووتن و راگوێزی هەیە و ئەو (بزووتن) و (راگوێزی)یەیش، ئاراستەی فیزیاوی تێدا هەیە.
- ئاراستەداری لە رووداوی کاردا بە دوو رێگا دەچەسپێت، یەکەمیان بە ئامرازەکانی پەیوەندی، وەك (دەچم بۆ زانکۆ) و دووەمیان بە جێگەی ئاخێوەری رستەکە، وەك هەردوو کاری دژ ئاراستە (هاتن) و (رۆیشتن).
- لە ئاستی ئەو کارانەدا کە ئامرازی پەیوەندی وەردەگرن، زاراوەی (کاری ئامرازدار) سەنگی خۆی هەیە، چونکە ئەو ئامرازانە باڵێکی تازە پەیدا دەکەن لە رووداوی کارەکەدا.
- زاراوەی (کاری ئامرازدار) دەبێت بە سەنگی مەحەك بۆ جوداکردنەوەی لە زاراوەی (ئاوەڵگوزارە). واتە، بەزەبری ئەو زاراوەیە دەتوانین ئەو هێڵە دیاری بکەین، کە چەمکی (ئاوەڵگوزارە) جودادەکاتەوە لە چەمکی (کاری ئامرازدار).
- لە هەر رستەیەکدا, کاری ئامرازدار بۆی هەیە یەك (ئامراز) وەربگرێت، بەڵام بۆی هەیە چەند ئامرازێك وەربگرێت، لە ئاوەڵرستە و ئاوەڵگوزارەدا.
- ئامرازی ئاوەڵگوزارە بریتیە لە (ڕایەخ) یان لە (زەمینە) بۆ قەوارەی هەر رستەیەك، بەڵام ئامرازی کاری (ئامرازدار) بریتیە لە باڵێك لە واتای کارەکەدا.
- ئەو ئامرازانەی کە لە لای (کاری ئامرازدار) پەسەندن، بەهیچ جۆرێك (ئاڵوگۆڕ) و (خستنەبری) ناچەسپێت بەسەریاندا، چونکە لە قەوارەی (کار)دان و دیوێکی تایبەتی دەنەخشێنن بۆ کارەکە.

